# نووسەری کورد

## گۆڤاری یەکێتیی نووسەرانی کورد

ژمارە ( ٢ ) ، خولی دووەم ، ئـابی ١٩٧٩

سەرۆکی نووسین

د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

سکرتێری نووسین

موحەمەدی مەلا کەریم

بارەگـای گۆڤـار

بغـــداد ـ الوزيريـــة

مقـابل كليـة التربية الرياضية

مقر جمعية الثقافة الكردية

لە چاپخانەی ( عەلاء ) لـە بەغدا لەچاپدراوە

# « الكاتب الكـــردي »

**مجلة « نووسەری کورد »**

مجلة اتحاد الادباء الاكراد في العراق

**العدد ( ٢ ) ، الدورة الثانيـــة ، آب ١٩٧٩**

رئيـــس التحريـــر

**الدكتـــور عـــزالدين مصـــطفى رســـول**

ســـكرتير التحريـــر

**محمـــد المـــلا عبـــدالكريم**

الادارة

**بغـــداد ـ الوزيريـــة**

**مقابـــل كلية التربية الرياضية**

**مقر جمعية الثقافة الكردية**

# THE KURDISH WRITER

BULLETIN OF

THE UNION OF THE KURDISH WRITERS IN IRAQ

**No. ( 2 ), Second Period, August 1979**

Editor - in - Chief :

**Dr. IZZADDEEN MUSTAFA RASOOL**

Deputy Editor - in - Chief :

**MUHAMMAD MULLA ABDULKAREEM**

Office : Baghdad, Wazeeriyyah, Opposite College
of Physical Education, Headquarters of
The Kurdish Cultural Society

# لەبارەی پیەسەکانمەوە

**● ناظم حیکمەت ●**
**شوکور مستەفا**
**لە تورکی‌یەوە کردوویە**
**بە کوردی**

یەکەم شانۆم لە کوێ‌و لە کەیا دیت ؟ ئەگەر قەرەگوێزیش[١] بە شانۆ لە قەڵەم بدرێ ، هەشت ساڵان بووم ، لە ئەستەموڵ ، لە ئاهەنگی خەتەنە سوورانمدا دیتم • کێ دەڵێ پێشووتریش لە قاوەخانەی گەڕەکدا ، شەوێ لە شەوانی مانگی ڕەمەزان سەیری قەرەگوێزم نەکردبوو ؟ سەیریشم کردبێ لەبیرم‌نەماوە • مەدداحیشم[٢] یەکەم‌جار هەر لە ئاهەنگی خەتەنە سوورانمدا گوێ لێ‌بوو • ئەوەی تا ئیمڕۆ لەبیرم مابێ سێبەری ئەو دارە باریکانەیە کە لەپشت پەردەیەکی هەر هێندەی بەری دەستێکەوە قەرەگوێزو حاجی وادیان[٣] دەجووڵاندەوەو بێ‌وچان جارێ درێژو جارێ کورت دەبوونەوە •

---

(١) [ قەرەگوێز = قەرەقۆز = ئەرەجۆز ] : بە سێبەری ئەم بیچم‌و سەرو سیما بنیادەمە لە چەرم‌و مقەبا دروست‌کراوە دەگوترێ ، کە لەپشت پەردەیەکی سپیی ڕووناکەوە یاریی پێ دەکرێ‌و زمانی حاڵی خەڵك‌و نوێنەری بیروبڕواو ئەندێشەو ڕای مەردمە • (وەرگێڕ) •

(٢) مەدداج : شایەر •

(٣) حاجی وادیش هەر شتێکە بابەتی قەرەگوێز ، ئەمیش هەر لەپشت پەردەڕا بەرامبەر بە قەرەگوێز یاریی پێ دەکرێ • لافی زۆرزانی‌و پسپۆڕی‌و ژیری لێ‌دەداو خۆی لە خەڵك بە بەرزترەوە دەگرێ‌و لە قسەو دەم‌ودوویدا خوێندەوارانەو فەیلەسووفانە قسان دەکا •

بەڕاستی سەیرە ، من تارماییی‌یە ڕەنگاو ڕەنگـەکانی قەرەگوێزو حاجی وادی پشت پەردەوەم لەبیر نەماوە ، کەچی سێبەری ئەو دارە باریکانەم لەبیرماوە کە جارێ دەردەکەوتن‌و جارێ دەسڕانەوە • بۆچی ؟ ئایا لەبەرئەوەیە کە ئەو دارە باریکانەی بەرو تەنگەو ، شان‌و شەپێلک‌و ، دەست‌و مەچەک‌و ، سـەرو کەللەی قـەرە گوێزو حاجی وادیان دەجوولاندەوەو ، ئەو قـەرەگوێز بازە نادیارەی کە لەپشت دارە باریکەکانەوە یاری‌یەکەی دەگێڕا ، نەک لە تەمەنی هەشت ساڵیدا ، بەڵکو ، قسە وا تێ ، لە تەمـەنی نۆزدە ساڵیمدا تێیان‌گەیشتم‌و دەرکم پێ کردن ؟ ڕەنگە لەبەر ئەوە بێ •

باشە ، ئەی لەبارەی مەدداحەوە چیم لەبیرماوە ؟ سـەرو کەللەو دەم‌و چاویم بە بیر نایەنـەوە • تەنانەت ئەو حەکایەتانـەی دەیگێڕانەوە ، لـەو لاساییی‌کردنەوانەی دەیکردنەوەش هیچ ئاسەوارێکم لەبیرنەماوە • بەڵام دەنگی تائێستاش لەگوێمدا دەزرینگێتەوە • لە تەمەنی هەشـت ساڵیمەوە تا تەمەنی شەست ساڵیم گوێم لەم جۆرە دەنگە بزۆزانە بوو • دەنگ‌گەلێـک ، بتەوێ‌و نەتەوێ ئیللا شتێکت پێ پەسەند دەکەن ، دەنگ‌گەلێک بۆ منەتبارکردنتان ، بۆ بە پێکەنین هێنانتان دەجوولێنەوە ••

لەوانەیە قەرەگوێزو مەدداح بە شانۆ دانەندرێن ، بەڵام ئۆپەرێت شانۆیە• یەکەم ئۆپەرێتیشم دیسان هەر لە ئەستەموول ، لە جەنگەی شەڕی یەکەمـی جیهاندا ، هەڵەم نەکردبێ ، لە ١٩١٥دا سەیرکرد • ئۆپەرێتەکە ئۆپەرێتێکـی ئاوسترییایی گەڕیدە بوو ، هاتبووە ئەستەموول • سەرەک ئاکتەرەکەی میلۆڤیچ ناوێک بوو ، ئاوسترییایی بوو ؟! شتێک بوو لەم بابەتانە ، تائێستاش لەبیرمـەو هەر دەڵێی لەپێش چاومە • ژنێکی دروشت‌و قەبەی شل‌و شەوێقی زۆر پەمەیی ڕەنگ ، فرە سپی ، زۆر قژکاڵ بوو • سێزدە ، چواردە ساڵان بووم ، لای ئێمە کوڕیش‌و کچیش زوو پێدەگەن • دەوڵەمەندانی شەڕ لێفەیان بە بانقەنۆتـی پێنج‌سەدی بۆ میلۆڤیچ دووری ، جگەرەیان بە هـەزار لیرەیی بۆ پێ‌کرد •

لەکاتێکا خەڵکی شاری ئەستەمووڵ لەو سەردەمەدا نانی ئاردی بەرە کەسکیان دەخوارد ، لاوەکان لە چوار جەبهەدا ، لە خوێنی ڕەواندا دەگەوزینو برسیو ڕووتو قووت بە شـــەڕ دەدران • بەڵکو هــــەر سەبارەت بەمەش بێ کـــە تائێستاش هەر جارێ پارچەیەکم لــــە ئۆپەرێتی چارداش بەرگوێ کـــەوێ لەلایەکەوە دەماری توورەییو قیژاندن دەمگرێو لەناخەوە تێروپڕ جنێودانــم دێ بە یەکێکیانو سەرتاپا دەبم بە یـــەك پارچە توورەییو یاخیبوون ، لـــە لایەکیدیکەشـــەوە سەرو چاوم گڕدەگرێ ، نێوانی مەمکـــە زۆر زلەکانـــی میلۆڤیچم ئێستاس لەپێش چاوە • تەنیا یەك جارم ســـەیری میلۆڤیچ کرد لـــە چارداش ، گێژ بووم ، بەڵام تووشی دڵداری نەبووم • یەکەم دڵداریم لەگـــەڵ ئەلیزا بەنەمەجیانی ئاکتەریسدا بوو • ئیمپراتۆرییەتی عوسمانلی ڕووخابوو • ئۆردووەکانی حوکوومـــەتی ئیئتیلاف ، ئوستۆڵەکانی ئەستەمووڵیان بەجـــارێ داگیرکردبوو • لە ئەنەدۆڵ ، لە هەموولایەکـــەوە هەستانو ڕاپەڕین دەســـتی پێکردبوو • یەکەم شیعرم لەمێژ بوو بڵاوکردبۆوە • ئەلیزا سەرەك ئاکتەریسی شانۆی (دار البدائع) بوو • هێشتا هیچ ژنێکی بە ڕەچەڵەك تورك پێی نەهاویشتبوە سەر شانۆی تورك • ئایینی ئیسلام نەیدەهێشت سەر شانۆ کەوێ • ئەلیزا بـــە ڕەچەڵەك ئەرمەنی بوو •• ئەرمەنییەکان بەشیان لە دامەزراندنی درامای نوێی تورك ، کۆمیدیای تورك ، ئۆپێرای تورکو ئۆپەرێتی تورکدا زۆر گەورەیـــە • مێژووی شانۆی تورك شانازی بە ماناکیانو پاپازیانو ئەلیزا بەنەمەجیانەوە دەکا •

نازانم لە (دار البدائع) لەپێشا لە کام پیەســــدا تەماشای ئەلیزام کـــرد ، لەبیرمنایەت • بەڵام هەر کە ئەلیزام دیتو نەدیت بە تیرێ پێکامی • ئەمەم زۆر چاك لەبیرە • لە سەتا سەت بە تورکیی خانمەفەندییەکانی ئەستەمووڵ قســـەی دەکرد • بە عومری خۆم چاویوا درشتو گـــەورەم نەدیتبوو ، کە قســـەی دەکرد ڕوومەتەکانی سوور سوور هەڵدەگەڕان • لووتی مەیلەو درشت بوو ، جووڵە نەرمو دەستو پەنجە ئێجگار سپیو ناسکەکانی هەر دەڵێی ئێستاش لە

بەرچاومن • یەکسەر لە شانۆ وەدەرکەوتم • گوتم دەبێ پیەس بنووسم ، ئەملاو ئەولای ناوێ ، دەبێ پیەسێك بنووسم • مەگەر بەم بیانووەوە کەمێك لە نزیکترەوە بتوانم ببینم ، بەڵکو دەستم بگوشێ • بەلام پیەس نووسینم بە زەحمەتترین کاری ڕوی زەوی دەزانی •

پیەسێك دەنووسم ئینجا جوانو زەریف دەیدەمە (دار البدائع) ، لەپاشان لە ریزی هەرە پێشەوەی هۆڵی شانۆدا ، نەخێر لە لۆجی درامانووسدا دادەنیشم ، سەیری ئەلیزا بەنەمەجیان دەکەم ، کاتێ پیەسەکەی خۆم یاری دەکا تەماشای دەکەم ••

دەشێ پیەسەکە بە شیعر بنووسم ، بەلام بابەتەکەی چی بێ ؟ بێگومان پیەسی دڵداریی یەکەم :

« لە گوێ ئاگردان » بەمجۆرە لەدایكبوو • پیاوێکی زۆر بەتەمەن ، زۆر ژیر ، زۆر چاك ، زۆر شاعیر لەسەر چیایەك دەژێ • شەوێکی بە بەفرو کڕێوەی پڕتۆفو وەیشوومە • ژنێکی شۆخی گەنجی زۆرجوان بە هەناسەبڕکێ لە دەرکەی دەدا •

پیرەمێرد دەرکە لە ژنە دەکاتەوە ، لەبەر گوێ ئاگردانەکەی دایدەنێ • ژنە لە شتگەلێك دەترسێ • پیرەمێرد ترسەکەی دەڕەوێنێتەوە • دەرکەکانی دنیای ئەقڵو حیکمەتو فەلسەفەو بیرو شیعری بۆ دەخاتە سەر پشتو ئەوە بە ژنە دەسەلمێنێ کە ئەگەر بێتو لەم دەرگایانەوە بچیتە ژوورەوە بە بەختەوەری دەگاو ئاسوودە دەبێ • شووشە بەفر بەستووەکەی پەنجەرەی ژوورەکە دەشکێو لاوێك خۆی بە ژووردا دەکا • مەڵێ ! ئەم لاوە ژنە راودەنێو ژنەکە لەو تۆقیوە • پیی‌دەڵێ : یاڵلا وەدووومکەوە تازە لە دەستم ڕزگار نابی • پیرەمێرد ، بۆئەوەی لە پەنجەرەوە هەڵنەیەن ، دەرگایان بۆ دەکاتەوە • هەردو گەنج ، نێرەکەیان لەدواوەو مێیەکەیان لە پێشەوە وەدەردەکەونو دەڕۆن •

لەوانەیە بپرسن بۆچی ئەمە یەکەم پیەسم بوو ؟ ئەوەی سەیـــر بـێ ، کابرای پیرەمێرد خـــۆم بووم • کەچی هێشتا لە تەمەنی هەژدە ساڵیمـــــدا بووم • لەپاشان بیرم‌کردەوە تومەز ئەم خـــۆ بـــە پـــیر زانینەم سەبـــارەت بەوە بوو کە بە هیچ جۆرێك نەدەکرا لەگەڵ ئەلیزادا بـــە یەك بگەین • ئەلیزا لەکوێ‌و من لەکوێ ؟! ئەلیزا کێ‌یەو من کێم ؟ تەنانەت مـــن ئەگەر بـــە شیعرم ، بەئەقڵم ، بە پیەسەکەم سەعاتێکیش لە بەر گوێ ئاگردان ڕایگرم خـــۆ لەپاش سەعاتەکە پەردە دادەدرێتەوەو شووشەی پەنجەرەکە دەشکێ‌و ، شان‌و شۆرەتی ئەلیزاو ئەو ژیانەی ـ کە ئـەوسا سەبارەت بـــە هەرچی‌یەك بوو پێم‌وابوو زۆر دەوڵەمەندە ـ ئـەلیزام لەدەست دەستێنێتەوە •

پیەسی «بەرگوێ ئاگردان»ەکەمم تەواوکرد ، بەڵام بـــە (دار البدائع)م نەدا • وا پێویست بوو بـــۆ ئەنەدۆڵ هەڵێم‌و هاوبەشیی شەڕی ڕزگاری خوازیی میللی بکەم • لە (١٩٢١)دا لە ئەنقەرە لە شانۆیەکی بێ‌سەروبەردا لەبەر چرای نەوتین‌و لە سەرما هەر ئەوەبوو ڕەق نەبمەوەو ، هەر سا نا ساتێ دەست‌و پـلم بە هەڵمی هەناسەم گەرم دەکردەوە ، «ئۆتێللۆ کامیلم» تەماشا کرد • بەدرێژایی تەمەنم تەنیا دوو جارم تەماشای شیکسپیر کرد • عەبدوڵڵا جەودەت ناوێکـــی جۆن‌تورك ئوستادی گەورەی ، بە زمانێکی پـــڕ لە وشەی عەرەب‌و عەجەم کردبوو بە تورکی • ئوتێللۆو هاملێت‌و فلان‌و فیسارم خوێندبۆوە ، سەرســـام بووم ، حەیران ببووم ، بەڵام تەواو تێی‌نەگەیشتبووم • کامیل ئاکتەرێکی گەڕۆك بوو • دەتوانم بڵێم تەنیا پیەسێك لە مەلەفەکەیدا هەبوو ، ئـــەویش هـــەر ئۆتێللۆ بوو • دەڵێن ئۆتێللۆیان بـــە شێوازی پاپازیان یـاری کـردبوو • حەیف سەیرکردنی پاپازیانم لـــە ئۆتێللۆدا بـــەنسیب نەبـوو ، بەڵام تەماشای ئۆتێللۆکەی شاگردەکەی کامیلم کرد ، ئەوسا زانیم پلەو پایەی وەستایەتیـــی ماموستاکەی چی‌یە •

لەو مانگانەدا کـــە لـــە ئەنقەرە بووم ، کامیل ، بگرە دە جـــاری

«ئەمیراڵی ڤەنەدیك» یاری كرد ، منیش سەیری یاریی هەموو جارەكانیم كرد .
نایشارمەوە عاشق بوونم بە شێكسپیر قەرزاربارى ئــەو وەرگێڕانە زۆر زۆر
خراپانەی عەبدوڵڵا جەودەتە ، بەڵام شاگردەكەیڤاگرام پاپازیان ئۆتێللۆ كامیل ،
شێكسپیری تێگەیاندم . كامیــل لەمێژە مردووە ، بە برسـێتی ، بە كوڵۆڵیو
نەخۆشیو لەشبەباری كۆچی كرد . پاپازیان هات بــۆ یەكێتیی سۆڤیــەت ،
ئیشەڵڵا ساغە ، دەزانم بوو بە نوێنەری گەل[٤] .

لە (١٩٢١)دا چووم بۆ باتۆم . چوومە ئوتێلێك ، ئــەوسا ناوی (فەرەنسا)
بوو . لەسەرێكەوە رۆژانە دوو لەگەن شۆرباى ئاردی گەنمەشامیو چارەكــێ
نانی ڕەشم دەخوارد ، لە سەرێكیترەوە سۆلەكانم لەبێ دەكردنو بە تەقەتــەق
دەچووم بــۆ كۆبوونەوەو كۆڕبەستن ، لە سەرێكیدیكەشەوە لە گۆڤــاری
نەقابەیسووری دەفتەرخانەی دەرەكیی دەستەی شۆڕشگێڕانی توركیادا كــە
بە ناوی نەقابەی سوورەوە دەردەچوو كارم دەكرد . لە سەرێكیتریشەوە ئــەو
پیەسانەم خوێندەوە كــە بە فەرەنسی لە زنجیرەی ڕەنگاوڕەنگی بچووكــدا
بڵاوكرابوونەوە ، نزیكەی سەت دانەیەك دەبوون ، بگرە زیاتریش ، یــەك
لە دوای یەك . لە دۆلابی ژووری ئوتێلەكەمدا بوون ، هەمووشیان بەر لــە
ســاڵانی (١٩١٤) بڵاوكرابوونەوە ، شەش مانگ لەگەڵ پەروەندەی ئــەوسای
شانۆكانی بولڤاری فەرەنسیو ڤۆدڤیلی فەرەنسیدا حەشرم كرد . نەك تەنیا لــە
دیوی ناوەوەی بۆرژوای بچووكی ئەو سەردەمە گەیشتم ، بەڵكو بەشێكــی
زۆری جیلوەكانی تەكنیكی پیەس نووسینیش فێربووم .

لەپاش پیەسی «بەرگوێ ئاگردان» پیەسێكی دیكەشم نووسی ، ئەوســـا
لەگەڵ نووسەرێكی توركی والا نوورەددین ناودا ، لە ئەنەدۆڵ ، لە بۆڵــوو
مامۆستایەتیم دەكرد . پیەسەكەم بــە ناوی «دڵ بەرد»ەوە نووسی : شێتێكــی

(٤) پاپازیان لە كاتی نووسینی ئەم وتارەدا ســاخ بوو ، لە ١٩٦٨دا
مرد ــ وەرگێڕ .

لادێیی دەبێ بە میوانی ئاغایەك ، لە دیوەخانەکەی گوێی لە خەڵکەکە دەبێ ، ناوی ئاغا بە کابرای «دڵ بەرد» دەبەن ، دڵ بـــەرد وای کردو دڵبــــــەرد وای گوتو چی ••• شێتە بـــۆ شەوێ سواری کۆڵەی سینگی ئاغا دەبــێ ، دەیەوێ دڵە بەردەکەی دەربێنێو دەیخنکێنێ ، بەڵام نە دڵی بەرد دەبینێو نـــە هیچ ، دەڵێ تفوو ، کابرا نە دڵی هەیەو نـــە تەڕەماش •• ئەم پیەسە بزوێنـــە کۆمەڵایەتی‌یەکەی ئاشکرایەو پیەسی گران گینیۆل لەمەدا گەلێ سوودی پـێ بەخشیم • شێوەی ئاخاوتنی لادێ‌یی‌یەکانی ، ڕاستر بڵێم شێوە ئاخاوتنـــــی لادێ‌یی‌یەکانی دەوروبەری بۆلووم وردکردنەوەو لێم‌کۆڵینەوەو هەر بەهۆی ئـــەم وردکردنەوەو لێکۆڵینەوەیەوە بوو پەڕینەوەم بـــۆ ناو زمانی گـــەل لەدوایدا ئاسان بوو و ئـــەرکم پێوە نەکێشا •

با بگەڕێینەوە سەروکاری ڕەنگاوڕەنگەکان لـــە باتـوم • ڕۆژێکیـــان پیەسێکی بـــە شیعر نووسراوی «بیتهۆڤن» ناوم بەرچاو کـــەوت • باقـــڵ خراپیش نووسرابوو ، ئێستا بیخوێنمەوە پەسەندی ناکەم ، بەڵام ئـــەوەی کـــە حەزم دەکرد بینووسمو تا ئێستاش هەر نەمنووسیو لـــە داخی نەنووسینی هەر وەختبوو بمرم پیەسێك بوو بابەتەکەی پێ ئیلهام کردم • ئەویش ئەوەبـــوو کە ژیانی کارل مارکس بکەم بە پیەسێك یا چەند پیەسێك •

یەکەم ئۆپێراو یەکەم باڵێو یەکەم شانۆی ڕاستەقانیم لـــە مۆســـــکۆ سەیرکرد • ئۆپێراکە شلەژاندمی ، بەڵام من قسە لەو سەردەمانە یانێ لـــــە ساڵانی (٩٢٠)و (١٩٢٨) دەکەم ، یانێ بەپێی باری ئەوسای شانۆو باری ئـــەو وەختەو دیکۆرەکانی «کارمێنی»ی ئـــەو سەردەمەو ناوی ئەوسای «کڕاسنی ماك» قسە دەکەم • (کڕاسنی ماك یانێ بووکەڵە کـــە باڵێی کۆمپۆزیتۆری کلیێرە) •

ڕاستو ڕووونتان دەوێ حەز لـــە ئۆپێرا ناکەم ، هونەرێکی زەحمەتو تووشە ، هونەرێکی گەورەیە ، بیناکانیشی زۆر گەورە دروست دەکرێـــن ،

لایەنی ڕەسمیشی هەیە • ئۆپێرا لە هەموو دەوڵەتێکدا شانۆیەکی ڕەسمی‌یـــە ، بەڵێ بەدەستی خـــۆم نیە ، نـــە لە یەکەم سەیرکردنیدا حەزم لێ کردو نـــە ئێستاش دەتوانم حەزی لێ بکەم • بەڵام وەنەبێ دەرزیشم لـــێ وەرنەگرتبێ ، دەرزم لـــێ وەرگـــرت ، ئـــەویش وەنـــەبـــێ تەنیـــا هـــەر لە مەیدانی دراما نووسیدا ، بەڵکو لە کاری شیعر نووسینیشدا ، تەنانەت زۆریشم سوود لەو دەرزانەش وەرگرت کە ئۆپێرا لە ژیانی ڕۆژانەمدا پێی‌بەخشیـم ، ڕاستری بڵێم ـ کە بەپێچـــەوانەوە پێی‌بەخشـــیم • پێویســـتیی بێ‌پەنـــاو پەردەیی ، بێ‌ڕووکـــــەشی ، بێ‌ئـــارایشی‌و بـــێ‌قەدیفەیـــم لـــە بۆڵشۆیدا تەماشاکرد ، لە ئۆپێراکانەوە فێربووم ، هیچم لە (مالی تیاتر) ،(شانۆی بچووك) لەبیر نەماوە • لەو سەردەمانـــە دەدوێم • لە سەردەمە تازەکانـــدا «دوورگەی ئافرۆدیت»م[٥] پێ خۆش بوو • وەختـــە لەبیرم‌بچێ ، ئوپێرا لـــە تێگەیشتن‌و زەوقی نیگارکێشی‌و پەیکەرتاشی‌و تەنانەت میعماریشدا تەئســـیری زۆر بوو • ئەو ڕەسمانەی کە لە شانۆ ، لـــە یاریی سەرشانۆو لە ئیشاراتـــی ئارتیستەکانی ئۆپێراو فلان دەچن‌و لـــە کۆمپۆزیسیۆنەکانـــی ڕەســـــم‌و پەیکەرەکان تائێستاش حەز لە هیچیان ناکەم • لە شیعرێکدا کە لە ساڵـــی (١٩٢٠)دا بـــۆ مەیەر هۆڵدم نووسیوە ، لەبـــارەی بۆڵشۆوەیە ، نووسیبووم : «بیناکەی تیاتری بۆڵشۆی دەشێ ببێ بـــە عەمباری جـــۆ » بێ‌گومان ناهەقیـم کردوە • هیچم لەبارەی باڵێکانی بۆڵشۆی ئـــەو سەردەمەوە لە بیر نەمـــاوە • بەڵێ باڵێ‌یەکم بە ناوی «یۆسفی جوان»ەوە سەیرکرد ، بەڵام هیی بۆڵشـــۆی نەبوو ، هیی دەستەیەکی دیکە بوو ، جا ئەوەی تەئسیری تێ‌کردم ئـــەم باڵێ‌یە بوو ، بەڵام چ‌باڵێ‌یەك ! چۆن پێویســـت بوونـــی بزووتنەوەو گۆڕانـــــی کۆمپۆزیسیۆن نەك تەنیا لە باڵێ ، لە دراماو ڕۆمان‌و شیعریشدا لەو باڵێـــــی

---

(٥) (دوورگەی ئافرۆدیت) ناوی ئەو پیەسەیە کە شاعیرو درامانووســـی هاوچەرخی یۆنانی (ئالێکسیس پارنیس) نووسیویە •

«یوسفی جوان»ەوە فێربووم • چەندین جاری دیکەشیان یاری کردبایـــەوە ، بۆئەوەی لە هەموو جارێکدا چل هەزار دەرزی لێ وەرگرم ، چل جـــاری دیکەش بـۆ سەیری دەچووم •

من چەندین یاریی تازە کوورەی ستانیسلافســکیو مەیـەرهۆلـــدو ڤاتانگۆفو تاهیرۆفی وام سەیرکرد بۆنو بەرامەی ژیانو شۆڕشو جوانـــیو قارەمانێتیو چاکەو ژیریو زیرەکی ، پیاویان مەستو کەشەنگ دەکرد •

من ئەو پیاوەم کە لە (١٩٢٢)دا پیەسەکەی گۆرکی «لەنێوان هەرچـیو پەرچییاندا»م لە شانۆی هونەریی مۆسکۆدا سەیرکرد • من ئـەو پیـاوەم کە پیەسەکەی نووسەری ڕووس سۆهۆگۆ بیلین «مەرگی تاریلین»و پیەسەکـــەی درامانووسی روس (ئا • ئۆستروۆفسکی) «فەرتەنە»و پیەسەکەی گۆگـــۆڵ «موفەتیش»م لە مەیەرهۆلد سەیرکرد ، من ئـەو کەسەم کـە پیەسەکـــەی نووسەری فەرەنسی «راسین» «فێدرا»م لە کامێرنیدا تەماشاکرد ، من ئەوکەسەم کە پیەسەکەی نووسەری ئیتالیایی کارلۆ گۆتسین «توراندۆت»م لە ڤاتانگۆفـــدا تەماشاکرد •• دەوجا وەرە ئـەم هەمووە بکەیتو تێگەیشتنی بەســــتووی چەسپاوت ژیرو زوور نەبێ ؟ گوایە چەندین ئاسۆی یەك لە یەك هەراوتـــرم لەپێش ناکرێتەوە ، بـــۆ نووســـینی ئـەو بەرهەمانەی کـــە میللەتەکەت ، میللەتانی هەموو دنیا ، مرۆڤ بـــۆ بەختەوەریو ڕووناکیو پێشکەوتـــنو هەڤپەروەریو ڕاستیو جوانیو ئازادیو برایەتی بانگ دەکەن ناسووتێـــیو هەڵناقرچێی ؟ منیش عەینی شتم لـێ بەسەرهات •

لێرەدا تەنیا دێڕێك قسەم هەیە : لەو سەردەمانەدا ، نوێکاری لە شانۆسازیدا بەپێی دابو دەستووری باو لە پیەسەوە نەدەهات ، بەڵکو لە هونەرو بەهرەی رێژیسوێر ـ مخرجو هونەرمەندو نیگارکێشـــەوە دەهات • یەکێ لـــەو جیاوازییانەی نێوان سەردەمی زێڕینی ئـەوساڵانەو ئەو سەردەمە زێڕینـــە

تازەیەی کە لەپاش کۆنگرەی بیستەم دەستی بەچریسکانەوە کردو شەوقی لە ساڵەکانی نزیکدا گەیشتە ئاسمان ـ قسە لە شانۆسازیی سۆڤیەت دەکەم .ـ ئەوەیە کە نوێکاریی ئێستا ، لە درامانووسیو پیەسەوە دەستی پێ کردووە . ئیخراجی ئەو سەردەمەو تاقیکردنەوەکانی شانۆسازی بەش بەحاڵی خۆم شەخصی کاریان لە درامانوسیی من کردووە .. بۆنموونە شانۆسازییەکانی مەیەر هۆڵد ، یا ستانیسلافسکی ، یا ڤاتانگۆفم رەچاوکردو بەپێی دەستووری ئەوان دەستم بە دامەزراندنی دراماکانم کرد . لە بنیاتنانی پیەسی «کاسەسەر»مدا فێرگەی مەیەر هۆڵد کاری گەورەیە . هەروەها لە بنیاتنانی پیەسی «پیاوە لەبیر کراوەکە»مدا ستانیسلاڤسکیو لە بنیاتنانی پیەسی «ئیڤان ئیڤانۆڤیچ هەبوو ؟ نەبوو ؟»مدا پیەسی «تۆراندۆت» کاریان گەورە بوو .

شانۆکانی سۆڤیەت کاریان پتر لە شیعرم کردووە تا شیعری سۆڤیەت . لێرەدا کە دەڵێم شانۆسازی مەبەستم درامانووسی نییە ، ئیخراجو هونەرمەندو نیگارکێشم رەچاوکردووە . دەتوانم بۆ کاری ئەمانە ، یەکە بە یەکە نموونە بێنمەوە . بەڵام لەبەرئەوەی کە لە خۆم زیاتر پێوەندییان بە کەسی دیکەوە نییە ، وازیان لێدێنم . شانۆکانی ئەوسای مۆسکۆ پێداویستی توانای لێکەڕانو وردکردنەوەو قووڵ بوونەوەو تەجریدکاریو تەعمیم کارییان تێمدا پەیداکرد .

ئەمەش وەنەبێ تەنیا هەر لە هونەردا ، بەڵکو لە گەشە پێ کردنو پەرەپێدانی ئایدیۆلۆژیکیشمدا یارمەتییان دام . ئەو دەرزانەی کە لە دانیشگای ڕەنجدەرانی ڕۆژهەڵات(٦) وەرمدەگرتن لەژێر پرۆژێکتۆرەکانی شانۆکانی ئەوسای سۆڤیەتیشدا خوێندمنەوە .. زۆر چاکم فەرق پێ کردووە کە شتێکم نووسیبێ ، با لەسەر بابەتێکیش بووبێ ، بە زۆری وەکو یادداشتێك بووە .

---

(٦) ناظم حیکمەت لە ساڵی١٩٢٢وەوە تا ساڵی ١٩٢٨ لەو دانیشگایە خوێندوویە .

کەچی ئەوکەسەی لەم دنیایەدا بیرەوەریی خـــۆی یادداشت نەکردبێ منم • بە قسەکەم پێمەکەنن‌و مەڵێن لەبەرچی ؟ چونکە شتەکە زۆر ئاشکراو سادەیە : ئێوە نازانن بیرم چەندە کولە • تەفسیلات‌و وردە ریشەی شتانم لەبیر نامێنێ ، ناوو مێژوو شتی‌وا لەبەرناکەم • جا لەبەر ئەمە ئێستا زۆر لە خۆم بکەم‌و بـیر لەوە بکەمەوە کە شانۆسازی تا چرادەیەك دەوری ـ ئەوە بخەرە ئەولاوە ، کە درامانووسێکی دەرەجە سێم ـ لە مندا بینیوە ، بەرانبەر بە گەورەیی ئەو دەورە سەرسام دەبم •

من ئەمەم لە تەمەنی شەست ساڵیمدا کەشف‌کرد • کاتێکی ئەم وتارەم بۆ گۆڤارێك دەنووسی • بەراستی سەیرە ! بەڵام سەرلەبەری رستەکانی ئـەم دەورەم ، لە نۆرەی خۆیدا لەبیرنەماوە • رۆمانێك دەنووسم (ژیان شتێکی جوانە براله) دەبێ دەسەوارەی ساڵی (١٩٢٤)ی پراڤدا تەماشا کـــەم • یەکەم رۆژ هەواڵووکەیەکی ئاواوایم خوێندەوە : لە (١٢)ی شوباتدا خوێندکارە تورکەکان لە دانیشگای رەنجدەرانی رۆژهەڵات بە سەرۆکایەتیی هــــاورێ ( مصطفی صبحی)یەوە شەوێکیان ، بە ناوی ئەو شازدە تورکەوە کە پیاوکوژە خۆ بـــــە کۆنەپەرست فرۆشتووەکان کووشتبوونیان رێکخست • لەپاش تەواوبوونی بەشی ئاهەنگی رەسمی ، لکی درامانووسی تورك بە یارمەتیی هاورێ ئێکەوە لە شانۆی مەیەر هۆڵد کاری شانۆســـازی بەرێوەدەبا پەسێکی هاورێ ناظمی ئەندامـی کۆللێکتیفی یاری کرد • پەسەکە سەرلەبەری کۆللێکتیفانە کاری تێدا کرابوو • دامەزراندنی پەسەکـە ســـەرنج‌کێش بوو • لە پەردەی یەکەمدا ، کۆششی هاورێ پێشکەوتخوازەکان لە (٢٨)ی تشـــرینی دووەمی (١٩٢١)دا لـەنێو ماتۆرێکدا پیشاندرا • لە پەردەی دووەمدا بەسەر مەکۆی چاپدا دەدرێ ، لـە پەردەی سێیەمدا لە ئەستەمووڵ پۆلیس کۆڵان بە کۆڵان چاویان بە هەر شتێك بکەوێ ژمارە (٢٨)ی پێوەبێ راویان دەناو لەم راونان‌و بگرەو بەردەیەدا گەلێ سەحنەی سەیرو سەمەرەو کۆمیك بەرچاو دەکـــەوێ ، لە پەردەی چوارەمدا

بەبۆنەی ژمارە (٢٨)ەوە هەرچی دەنکە جۆیەکی ماڵی ژمارە (٢٨)ی خواردبێ بە ناوی شۆڕشگێڕێکی راستەقانی‌یەوە باسخوون‌و مەحکەمە دەکراو حوکم‌دەدرا • پیەسەکە بە بەرگی میللی‌یەوە یاری‌کرا • شانۆسازی‌یەکی ناوخۆیی‌یانە بوو • ساڵۆنەکە پڕ بوو لە میللەتانی هەمەجۆرو تورکی‌نەزان ، لەگەڵ ئەوەشدا یاری‌یەکە سەرنجی کێشان •

ئەم چەند دێڕە کە لە (١٢)ی مارتی (١٩٢٤)دا پراڤدا بڵاوی‌کردووەتەوە پێم‌وایە یەکەم بەڵگەیە کە لەم نووسینەمدا هێنابێتمەوە •

کەواتا ناوم بۆ یەکەم‌جار لە (١٩٢٤)دا کەوتۆتە سەر لاپەڕەکانی پراڤداو ئاخۆ وەکو پیەسنووسێ کە بۆ یەکەمجار چاوم بە ناوی خۆم کەوت چەندم کەیف پێ سازبووبێ • بۆ درۆ بکەم وەڵڵا یەکەم رۆژ کە چاوم بەم چەند دێڕە کەوت لە پراڤدادا نووسرابوو دڵم لە خۆشی‌یان بە تەپەتەپ کەوت • بڕوام نەدەکرد ، لە دڵێ خۆمدا دەمگوت داخۆ پراڤدا کەی ناوی منی بیستبێ •

لەگەڵ نیکۆلای ئێکدا لە مۆسکۆ هەرەوەزی شانۆی (مێتلا ـ گەسك)مان دامەزراند •

باقڵ ئەمە یەکەم‌و دووا هەرەوەز بوو • بە ڕوونی مێژووەکەیم لەبیرنەماوە ، بەڵام پۆستەرو ئیعلانەکانیم تائێستاش لەبێش چاوە • گەسکێکی کلك درێژ لەسەر قورسێکی سوور • مەبەستمان روون بوو • لەلایەکەوە مەبەستمان ئەوەبوو کە هەرچی خڵتەی بیروباوەڕی بۆرژوواو بۆرژووای بچووك‌و دەرەبەگایەتیی نێو ژیانی رۆژانەی مەردم‌و مێشك‌و دەرونیان هەیە بە گەسك بماڵدرێ‌و لە لایەکی‌دیکەوە مەبەستمان ئەوەبوو کە شانۆکانی مۆسکۆ لەو خڵتانە پاك‌کرێنەوە ، کە لە رووی زانینەوە ، یان نەزانینەوە لافی باراستنیانمان دەدا • حەوتووی دوو جارمان لە سینترالنیی ئێستا ، کە جاران ناوی « شاپووار ـ سینەمای مۆسکۆ » بوو یاری دەکرد • ئێرە یانەی دانیشگای

ڕەنجدەرانی ڕۆژهەڵاتیش بوو ، منیش وام بەبیردا دێ کە ماوەیەك سەرۆکی یانەکە بووم ، بەڵام زۆر چاکم لەبیرە کە نیکۆلای ئێك کاری لکەکانی درامای یانەکەی دەگێڕا •

لەبیرم‌چوو : هونەرمەندەکانمان بە دوو جۆرە تاقی‌کردنەوە هەڵدەبژارد :

١ ـ تاقی‌کردنەوەی ئاکتەری ، ئەمەیان ئێك دەیکرد •

٢ ـ تاقی‌کردنەوەی سیاسی ، ئەمەیان من دەمکرد •

سەروتاری ئەو ڕۆژەی پراڤدام بە دەستێنیشان کراوەکـان دەخوێندەوە ، لەپاشان لە بابەتە سیاسی‌یەکانی ناوخۆو دەرەوە دەستمان بە پرسیار لێ‌کردنیان دەکردو ئەزموونم دەکردن • شانۆکەمان لافی دامەزراندنی یەکێتیی ئۆرگانیکی سیاسەت‌و شانۆی لێ دەدا • دیسان وەکو لە بیرم بێ ، پیەسەکەی خۆمان بە ناوی «قەباحەت لە کێ‌یە» وە لە «مێتلا» یاری‌کرد لەگەڵ ئێکدا • وابزانم شتێکی دیکەشمان بە ناوی «کیرپیچکی»یەوە نووسی • ئەم ناوەمان لە گۆرانی‌یەکەوە وەرگرت کە بە ژنە کرێکارێکی ڕووسدا هەڵدرابوو کە دەورێکی زۆری دەبێ لە سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی کارخانەیەکدا • پیەسی « قەباحەت لەکێ‌یە » تەنیا یەك پەردە بوو ، لە تاوان‌و دزێتی‌و بێ‌ئاکاری‌و شـــتی‌وا دەدوا کە لە ڕژێمی سەرمایەداریدا پەنگیان خواردووەتەوەو قەباحەت‌و تاوانی دەخســـتە ئەستۆی کۆمەڵ نەك تاك • هەرچی ئەوەی پێشوو بوو لەدووایـــدا بیستمەوە زمانزەد ببوو ، بـــەڵام خۆی لەبارەی گۆرانی‌یـــەکی زۆر جوانی شاری بەناکانـــەوە دامەزرابوو کە بە ناوی (کیرپیچکی)یەوە بوو • لە شەڕی یەکەمی جیهـــان ، لە شۆڕشی کشتوکاڵ ، لە یەکەم ڕاپەڕینی ئابووری دەدوا • لـــەم یاری‌یـــەدا سینەمامان زگماکانە لەگەڵ شانۆدا یەکانگیر کردبوو • بەنموونە :

یەکێ لە قارەمانەکانی هاوبەشیی لە خۆپیشاندانێکی کۆڵاندا دەکرد ، ئەم دیمەنەمان لەســـەر پەردە تەماشـــا دەکرد • قارەمانەکە لە خۆپیشاندانـــەکـــە

جیادەبۆوەو لە دەرکیماڵێکی دەداو دەچووە ژووری ، ئینجا لە پەردەکــەوە دەهاتەدەرێو خۆیدەدایە پەنای کۆلیتی سەر شانۆکە . قاعیدەو دەستوورمان ئەمەبوو :

هەرچی دیمەنو ڕواڵەتی دەرەوە بوو لەسەر پەردەو ، هەرچی هیــی ناوەوە بوو لەسەر شانۆ پیشان دەدرا ، بەڵام وەکو گوتم ئەمەش وەنەبێ وەکــو دوو شتی لێك هەڵبڕاوو جیاواز ، بەڵکو وەکو دوو شتی پێکەوە جۆشدراو .

پیەسی (گەسك) لەپاش ئەوەی شەش مانگ بەرگەی گرت خودی خۆی لە دنیای شانۆسازیدا ماڵدرایەوەو ئاســەواری نەما . جا ئێستا هەرچەنــد بیردەکەمەوە ، نازانم ئەمــە چۆن ئەو شەش مانگە بەرگــەی گرت ، شتێکی سەرسووڕێن بوو ! بەڵام ئێستا گەیشتمە ئەو ڕاستییە کە خلتەی دنیا کۆنەکانی نێودڵو دەروونمان هەروا بەئاسانی نابــەزێ ، بەڵکو پێویســتە بە چەکێکی کاریگەرترو قووڵتر ، بە چەکێکی پێشــکەوتووتر بەگژیدا بچینو بیبەزێنین . هەروەها گەیشتمە ئەو ڕاستییەش کە سەرنەکەوتنی گەسکەکەمان بەشبەحاڵی ئیمکاناتی ئەو سەردەمەو بەشبەحاڵی تێگەیشتنی شانۆسازیی ئــەو ڕۆژگارە کارێکی زۆر تەبیعی بوو . بەڵام مرۆڤ هــەرچییەك بێ حەز لە شــانازی بەخۆوەکردن دەکا . ئایا ئەم حاڵەتە ڕۆحییەش خلتەیەك نییە ؟ بەڵێ خلتەیە . ئارەزووی بەخۆوە نازین دەکەین ، بڕوانن کاتێ نووسیم سینەماو شانۆمان وەکو بتوونێکی زگماك بەکارهێنا بێباکانــە شانازیم بەخۆمــەوە دەکرد . ماوەیەك پێموابوو ئێمە ئەم کارەمان زۆر لەپێش «لاتیرنامازیك»ی چیکەکانەوە ، یا بــە «مۆنۆنێکران ــ یەك پەردە»یش بــێ ــ بەدی هێناوە ؟ کەچی لەو ساڵانەدا ئەم تاقیکردنەوانە لە هەموو دنیادا دەکرانو ببوون بە باو . تەنانەت لە ئەستەموولیش فیلمێك ، پێموایە فیلمێکی ئەڵمــانی بوو ، ســەرەك ئاکتەریسەکەی لەســەر شانۆیش یاریی دەکرد . تاقی کردنەوەی (گەسك) دووایییەکەی هەســتی درامانووسییەکی تێمدا گەشە پێکرد . لــە بنەچەکدا لەسەر بنجی پیەسی

«کاسه سەر» ڕوواوە • ئـەو سەردەمە سەروەر بە مارکس‌و ئینگلس‌و لێنینەوە گلابووم ، بەڵام چۆن گلانێك ! ویستم سەرلەبـــەری کتێبەکانی لێنین ڕاستەو ڕاســت بخەمــە ســـەر شانۆ • هێنـــام کتێبی « ئیمپریالیـــزم دووا قۆناخـی سەرمایەداری‌یە»م سیناریۆ کردو قارەمانــە دیاری کراوەکانیشم لە کارەکـــەدا هاوبەش کردن • ئەویش نەك بۆ سینەما ، بۆ « گەسك »ەکەی لەمەر خۆمانم سازکرد • بەڵام یاری‌کردنــەکەی بەقســـمەت نەبوو ، بالێیــەکیشم بۆ «مەیەرهۆڵد» نووسی بەناوی «ئەهرام»ەوە بوو ••• ئەهرامێکی سۆسیـال ، بە هێزە بەرهەم‌هێنەکانی بنەڕەتی‌یەوەو لەگــەڵ پێوەندی‌یەکانی بەرهەم‌هێنــە سەرخانی‌یەکانیدا • هێنام بۆ (مەیەرهۆڵد) ، خوێندیـــەوە • پەسەندی کرد • بەڵام نەیخستە کایـــەوە • جگە لەمانـــە پەسێکی شیعریشـم نووسی ، ناوی « چواردەی مانگ » بوو • یاخی‌بوونێکی ناو گەمیەیەکی ئەتلانتیکی رادەگەیاند ، بەڵام تەماشای نەسڵەکەی بکەن ، گەمیەکـە بە وەجاخـەوان‌و مەکینەوان‌و ئاگرەوان‌و کرێکاران‌و ڕێبوارانی سەربان‌و دەرجە دوو و دەرەجە یەك‌و دەرەجە لۆکس‌و کەپتانەکانیەوە نموونـەی کۆمـــەڵێکی لاسایی‌کراوەی سەرمایەداری بوو • پیەسەکـــەم تەواو نەکرد • نەخرایە کایـەوە ، بەڵام بەشـێکی زۆری پارچەکانیم لە ڕۆمانە شـیعری‌یەکـــەی « بەنەرجی بۆچی خۆی کوشـت »دا بەکارهێنا •

یەکەم نوسخەی پیەسی « کاسە سەر »یشم هەر بۆ « گەسك » نووسی ، نەخرایە کایەوە ، ئەم نوســـخەیەیان ونبوو • دووەم نوســـخەیم لە تورکیا نووسی • هەر کە نۆرەی هات لە بابەتەکەی‌و یاری‌کردنەکـەیتان بۆ دەدوێم • داوتەڵەبی ئەم پیەسەش یەکێ لە دەستوورەکانی مارکسیزم بوو •

سەرمایەداری لە پەرەسەندندا دەگاتـــە قۆناخێك تەنیا بە شـتی ماددی داناکەوێ ، نرخە مەعنەوی‌یەکانیش دەبن بـــە ماڵ‌و دەکرێن‌و دەفرۆشرێن • هەر کە هەوڵی وەبیرهێنانەوەی ئەو ساڵانە دەدەم ، جارێکی‌دیکە هەست بـــە

شتێکی‌تر دەکەم • کارێکی گەورەی شانۆسازیی سۆڤیەتو سەرومڕ بە شانۆسازیی سۆڤیەتەوە گلانم کارێکی گەورەیان لە تێگەیشتنی هونەریو چالاکییەکـــانم کردووە • ئارەزووی ڕاستەو ڕاست لەســـەر شانۆ نواندنی کتێبەکـانی لێنین وای‌لێ‌کردم شیعریش بۆ ئەم‌کارە تەرخان بکەم • هەمیشە بیر دەکەمەوە ئایا لە درامانووسیمداو هەر بەبۆنەی دراما نووسییەوە لە شیعریشدا کام شانۆســازی بۆ ئەم ئەزموونو تاقی‌کردنەوانەی پاڵ پێوە نام ؟ لەم ئەزموونو تاقی‌کردنەوانە هیچ پەشیمان نیم • تا ئیمڕۆیش هەر سوودیان لێ وەردەگرم • ئەوەی پاڵی بۆ ئەم تاقی‌کردنەوانە پێوە نام (مەیەر هۆڵد) بوو • بەڵام ئەوەی لە ئوستاد فێر بووم تەنیا هەر ئەو گرنگی‌یـــە نی‌یە کە هونـــەر لە خزمەتی ڕوون‌کردنەوەی ڕووی سیاسەتدا بێ ••

ئێمە کە دەڵێین یەکـــە میراتگری ئـەو نرخو بایی‌یە ڕاستەقانی‌یانەین کە سەرلەبەری مرۆڤایەتی لە سەرانسەری هەموو سەردەمەکاندا ، لە ئاسیا ، لە ئەفریقا ، لە ئەورووپا هێناویانەتە گۆڕێ ، کـە ئەمە دەڵێین گەلێ نموونـەی پرشنگداری تەتبیقاتی مارکسیست لینینیستی سەر بـە هونەری ئیخراجم لـە ئوستادمدا بەدی‌کرد • منی درامانووسو شاعیرێکی شۆڕشگێڕ قەرزارباری زۆر شتی مەیەر هۆڵدم کە نرخەکانی ئیخراجی ڕاستەقانیی شانۆ کلاسیکەکانی ئاسیا تا دەگاتە شانۆ گەلی‌یەکانی ئێمەو سەرلەبەری شانۆکانی ئـــەورووپا بەو مێژووە دوورو درێژەیەوەو هەرچی دابو دەستووری گـــەورەی شانۆسازیی ڕووس هەبوو بە پاک‌کراوی لەپێش دانام •

کە دەڵێم قەرزارباری زۆر شتیم مانای ئـەوە نیە کـــە قەرزاری هەموو شتێکیم • دوویاتی دەکەمەوە لە مەیدانەکانی دیکەی هونـــەری شانۆسازیـــدا قەرزارباری زۆر شتی ستانیسلاڤسکیو ڤاتانگۆڤو تەنانەت تاهیرۆڤیشـــم • ئەگەر لە سەرلەبەری تێگەیشتنی هونەری شانۆسازیم دەپرسی وەنەبێ لە سەتا سەت بەوکەســەوە بەسترابێتم ، نە بـە ستانیسلاڤسکی ، نـە ڤاتانگۆڤ نـە بـە

تاهیرۆفەوە ، ئـەوان تا چ ئەندازەیـەك پێکەوە بەسترابن ، هەڵبەتـە پێکەوە بەستراون ، تەنانـەت لێکیش هەلکێشرابن ، تێگەیشـتنی شانۆسازیی ئەمڕۆی منیش هەر بەو ئەندازەیەو بەوجۆرە بە هینەکانی ئەوانەوە بەستراوە • بەڵام لەولاشەوە شانۆسازیی سۆڤیەت هـەر لەپاش کۆنگرەی بیستەم راپەڕینێکـی گەورەی دیکەشی بەرپا کرد ، بێ ئـەوەی پێوەندی لەگـەڵ داب و دەستوورە گشتیی و میللییەکانی خۆیدا بپچڕێ ، راپەڕینێکی بـەرپا کردو منیش ئەمڕۆ وەنەبێ تەنیـا هەر لەگـەڵ موخریجە گـەورەکانـدا ، بەڵکو لـەگەڵ درامانووسەکانیشدا هاوپێوەندم •

لاموایە ساڵانی (١٩٢٨ و٢٩) بوو • نەخۆش بووم ، لە ماڵەوە کەوتبووم ، هاوڕێکان گیرابوون ، لە ئەسـتەموول لە پۆلیسخانە دووای ئەوەی بە ئاگـری جگەرە سنگە رووتەکانیان سووتاندبوون و زوێڵە چەرمی ژێر پێیان بـە زۆیای گەرمەوە بەجێمابووو هێلکەی کوڵاویان بە سەعات لەژێر هەنگڵیان دانابوو ، بۆ مەحکەمە کردنیان ناردبوونیان بۆ ئیزمیر • تا بڵێی نەخۆش‌بووم ، بێخەرجـی بووم • دەرکەم کرایەوە • موخریجی گەورەی تورك ( محسن ئۆرتوغروڵ ) خۆی کرد بە ژووردا • محسن یەکێ بوو لە دامـەزرێنەرە کارامـەکانـی شانۆسازیی نوێی تورك ، یەکێ بوو لەوانـەی کـە دیزپلینی شـانۆسازیی نوێی تورك ، بەتایبەتی هینەکانی رووس ـ سۆڤیەتی بەدی هێنابوو و عاشـقی ستانیسلاڤسکی و مەیەر هۆڵد بوو • چەند جارێك هاتوچۆی سۆڤیەتی کردبوو • دۆستم بوو ، گوتی : پیەسی ئامادەکراوت هەیـە ؟ گوتم : هەمە • بەراستـی نەشم‌بوو • گوتی : ئەگەر دووای حەوتوویەکی‌دیکە بمدەیتێ دەیخەمە سـەر شانۆ • گوتم : باشە • داوای یاری‌کردنی پیـەسێکی من لە تاکە شانۆیەکـی راستەقانیی ئەسـتەمووڵدا ، لە گەرمـەی تیرۆری دژی شۆڕشگێڕانی لـەو رۆژگارەدا بەلامەوە هیچ سەیرو سەمەرە نەبوو • محسن دۆستم بوو • من باوەڕ بە دۆستایەتی دەکەم • دووای ئەوەی محسن رۆیشت بیرم‌کردەوە من لە

ناوەی حەوتوویەکدا چیم پێ دەنووسرێ • بابەتی پیەسی « کاسە سەر »ەکەم بەبیرهاتەوە کە دەست پۆلیس کەوتبوو و لەناوچووبوو •

پیەسەکە لەوە دەدوا کە سەرمایەداری نەك هەر نرخە ماددی‌یەکان ، بەڵکو نرخە مەعنەوی‌یەکانیش دەکا بە ماڵو دەیانخاتە بازاڕەوە •

لە ناوچەیەکی « دۆلاریاندا » ناو پرۆفیسۆرێکی « دالبانیزۆ » ناوی زۆر هەژار ماکی دەردە باریکە دەدۆزێتەوە • راستر بڵێم ، نەزەری‌یەی ماکەکــە دەدۆزێتـــەوە • ترۆستی (سەناتۆریۆمەکان ـ مصحەکان)ی دەردە باریکـــە دەکەوێتە هەراسانیو شڵەژانەوە • تەکلیفێکی ئاواوایی پرۆفیسۆر دەکاو دەڵێ : ئەو پارەو پوولو موختەبەرەی کە بۆ بەدی‌هێنانی ساخکردنەوەی ماکەکـــەت پێویستە ئێمە لەئـــەستۆی دەگرین • بەڵام ئێوە بۆ ماوەیـــەکی دیار ، کاری ماکەکەتان بخەنە لاوەو خەریکی تیمارکردنی مانگاکانمان بن • پرۆفیسۆر لەپێشا قایل نابێ ، بەڵام دوایی دڵ کەچ دەکاو پەیمانێك لەســـەر ئەمە ئیمزا دەکا • دەردە باریکە سواری کۆڵی کچەکەشی دەبێ • بۆئەوەی لە ماوەیەکی دیاردا مانگاکان تیمار بکا لە ئەزموونگـــەی یەکێك لـە مصحەکاندا دادەمـەزرێ • بەڵام پرۆفیسۆر چاوەڕێی ماوەی پەیمانەکـە ناکاتو ماکەکـــە ساخ‌دەکاتەوەو رزگارکردنی کچەکەی بەپێویستتر دەزانێ • ماکەکــە بەدزی‌یەوە رەنێو دێنێ • بەڵام لەپێش ئەوەی بە کچەکەی‌بدا بە تۆمەتی پەیمان شکاندنو بارمتە نەدانەوە دەخرێتە بەندیخانەوە • لەپاشان لە بەندیخانـــە دەردێ • لە سێرکدا کۆمبارسی دەکا • دوایی دەمرێ • تەنانەت کاسە سەرەکـەشی لە تەشریحخانە دەفرۆشرێ •

ئەم پیەسەی کە رێبازە سەرەکی‌یـــەکانیم بۆ روونکردنەوە تـەنیا سێ شەوان لە ئەســـتەمووڵ یاری‌کرا • چوارەم شـــەوی بە فەرمـــانی ئەنقەرە یاساغ‌کرا • بڕوبیانووی یاساخ کردنەکەشی ئەوەبوو کە گوایە بەیتاڵەکـــانی

ولات لەسەریان هەڵداوەتێو شکاتیان کردووە • لە پیەسەکەدا پرۆفیسۆر دەڵێ : خۆ من بەیتاڵ نیم ، تەماشای مانگا ناکەمو بەمە رۆڵیکێکی دەکەوێتە نێو پیەسەکەوە • بەڵام هۆی ئەسڵی ئەوەبوو کە سەیرکەرەکان لەدووای پرۆمێرەوە ـ ساڵۆنەوە کە بەشی زۆریان لاوو کرێکار بوون ـ خۆپیشاندانێکیان بەرپاکرد • سەعاتێکی تەواو لە ساڵۆنەکە نەهاتنەدەرێ ، ئێمەیان چەندین جار بۆ سەر شانۆکە بانگ کرد • ئاخرییەکەی من لە دەرکەی پشتەوە دەرچووم • بەڵام کۆڵان یەکێکی دیکەی نەدەگرت • منیان خستە ناوەڕاستی خۆیانەوەو لە شێوەی جەماوەرێکی بەرفرەواندا بەو نیوەشەوە بە جاددەی ئیستیقلال وەربووین • لەپاشان ، گوتم یاساغ کرا •

«کاسە سەر» پێموایە یەکەم پیەسێکە کە لە تورکیا بەپێی مەبادیئی فێرگەی مەیەر هۆڵد بۆ شانۆ سازکرابێ • وەکو گوتم من ئەم فێرگەیەم وەنەبێ بە هەمووو مەبادیەکانیەوە ، بەڵکو بە هەندێ مەبادیەوە سوودم لێ وەرگرتو لە رادیۆی مۆسکۆش لە (١٩٥١)دا ئەم پیەسەی چەند جارێك یاری کرد • پێش چەند ساڵێك سەیر کردنیم لە شانۆی درامای گەنجەش بەنسیب بوو • لەگەڵ ئەکبەر باباییفو رۆماننووسو درامانووسی ئازربایجانی مەنتی حوسێنیشدا سەیرمان کرد • من خۆم یارییەکەیم بە دڵ نەبوو • لە نووسینی پیەسەکە پەشیمان نیم • بەڵام پیەسەکەم پەسەند نەکرد • کەچی ئوستاد پیەسەکەشو یارییەکەشی پەسەندکرد •

شانۆسازییان لە چمێژوویەکداو کەی لەپێشا ئاخنییە نێو قووتوویەکی قەپاتکراوی بەئالاو والاو قەدیفەدارو بەبریقو باقو ئارایشتدراوو پەردەدارو بەدیکۆرەوە ؟ نازانم ، ئەمە چاك بوو ، خراپ بوو ؟ مەبەستم ئەوە نییە • ئەمە لێرە بە با ناکەم • من بەشبەحاڵی خۆم جاروبار بە تاسەی یاریی شانۆی هەوای رەها و ناوبازاڕو مەیدانی شارەوەم •

ساڵەکەیم لەبیرنەماوە • جارێکیان بەبۆنەی جەژنی منداڵانەوە ، بۆ

یاری‌یەکانی شایی‌و زەماوەندەکانی موسابەقــەیەکیـــان ڕێك‌خست • لەگەڵ نیکۆلای ئێکدا هەردووکمان هاوبەشیمان تێدا دەکرد • پیەسەکـــەی ئێمەیش لەوانەبوو کە بە یەکەم لە قەڵەم دران • حەوتوویەك لـە سێرکدا یاری‌کرا • موخریجەکـــەی (ئێك) بوو ، یاری چ لـــە سێرکی داخراوداو چ لـــە هی گومەزداردا بێ ، شانۆ چ لە هــەوای ڕەهاو چ لە بازاڕو مەیـــدانی شاردا بێ ئەوەی تیاندا دەژی گەلایەتی‌و یاری‌و زەماوەندەکەیەتی •

لە پیەسەکەی ئێمەدا هونەرمـــەندەکانی دراماو هونەرمەنـدەکانی بالێ‌و هونەرمەندەکانی سێرك بە ئینسان‌و بەستەزمانە هونەرمەندەکانیەوە ـ هەریەکـە لەلایەکەوە یاری‌یان دەکرد • ڕووداوەکان لە زەویش‌و لە عاسمانیش ، لـــە چوار پەردەی سینەمادا ڕوویان‌دەدا • تەنانەت تەماشاکەرانیش ـ کە زۆربەیان منداڵ بوون ـ ناوبەناو هاوبەشیی یاری‌یەکـــەیان دەکرد • لەکاتێکا ئەمانـــە دەنووسم ، داخی ئەوە دەمکوژێ کە ئێمە بۆچی ئەم تاقی‌کردنەوەو ئەزموونەمان بۆ پتر گەشەپێکردنیان ، دووبارە نەکردەوە •

دیسان زنجیرەی بیرەوەری‌یەکانم لێ ئاڵۆزکا • ئاگام لێ‌یە سەروبەر هەر سکاڵا دەکـــەم • بەڵام ئایا پیاو هـــەرچی بیرەوەریی هەیە لە پێڕۆیەکـــی کۆڕۆنۆژی‌و بەپێی زنجیرەی مێژوو ڕیزیان دەکا ؟ •

محسن ئۆرتوغرول دوو پیەسی دیکەشمی لە ئەستەموول ، لە (١٩٣٠)دا خستە کایەوە یەکێکیان « ماڵی مردوویەك » ، ئەوی‌تریان « پیاوە لە بیرکراوەکە » بوو • نوسخەی دووەمی « ماڵی مردوویەك »ەکەم چوار پێنج ساڵ لەمەوپێش لە شانۆی « کۆمیسار ڕێشکی » لە لینینگراد یاری‌کرا • بەڵام ناوەکەیم گۆڕی ، کردم بە « یەکەم ڕۆژی جەژن » لەگەڵ میخایل زۆشینکۆدا چووین بۆ هۆڵی شانۆ • ئوستاد پیەسەکەی پەسەندکرد • منیش زۆرم دڵ خۆش بوو • کۆمەڵێ چیرۆکی زۆشینکۆم کرد بە تورکی • عاشقی وەستایەتیی ئەو ئوستادەم • لـــە

سەردەمێکدا چاپەمەنی‌یەکانی بۆرژووای تورك دەستیان بە قیڕەقیڕ کردبوو ، کە گوایە « مرۆڤ لە یەکێتیی سۆڤیەت پێکەنینی لەبیرچۆتەوەو ئەدەبی کۆمیكو پێکەنین لەو ولاتە مردووە »و چی • بلاوبوونەوەی بەرهەمەکانی زۆشینکۆ بە تورکی زۆر بەسوود بوو • لامۆایە هەزاران هەزار خوێنەرانی تورك بە خوێندنەوەی چیرۆکە تاڵەکانی زۆر قووڵو دوور لە هەموو رەنگ‌وبۆیەکی رەشبینی ، یەکێتیی سۆڤیەتیان خۆش‌دەویست • بابەتی «ماڵی مردوویەك» کێشەی کلاسیکی میراتی بۆرژووایە • تەنیا چوار رۆژ یاری‌کرا • بەلام میری یاساغی نەکرد ، نەخێر ، سەیرکەر نەهاتن • جا با هۆ و سۆنگەکەیتان بۆ روون‌کەمەوە :

بە رەچاوکردنی ئەزموونی « کاسە سەر » لەپاشان دەرکەوت کە ئەم تەجرەبەیان زیاد لە پێویست رەچاو کردبوو ـ بۆ یاساخ کردنی پیەسە تازەکە ناوی نووسەرەکەیمان گۆڕی • سەبارەت بەمە زۆربەی سەیرکەرەکان خوێنەری من بوون • بۆرژوواو وردە بورژووا بوون • هەر لە ناوەندی پەردەی یەکەمدا دەستیان بە قیڕەقیڕ کرد ، گوتیان : ئەمە چرەزالەتێکە ! موقەددەساتمان سووكو ریسوا دەکرێن • لە پەردەی دووەمدا هۆڵەکە نیوەی زیاتر چۆڵ ببوو • لە ناوەندی پەردەی سێیەمدا گالەری نیوە قەڵەباڵغێك بوو ، بەلام هەر چوار پێنج کەس لە سالۆنەکەدا مابوونەوە • عەرزم‌کردن لەپاش تەماشاکردنێکی‌وا بەشەوقو پرشنگداری پیەسەکە تەنیا هەر چوار رۆژ خۆی گرت ، جا هەر سەبارەت بەمە محسن پیەسەکەی تری بە ناوو ناتۆرەوە خستە شانۆوە ، سەرەك دەوریش خۆی یاریی کرد • « پیاوە لەبیرکراوەکە »م لە ۱۹۳۳دا لە یەکێ لە بەندیخانە هاتنەدەرەوەکانمدا ، نووسیبوو • بابەتەکەی بەکورتی : پرۆفیسۆرێکی زۆر بەناوبانگ یاریدەرێکی گەنجی دەبێ ، ژنەکەشی گەنج دەبێ ، پرۆفیسۆر کوژراوی ناوبانگو دیلی ئاکارو رەفتاری بۆرژووا دەبێ • لەحاڵێکدا کە سوور دەزانێ ژنەکەی لەگەڵ یاریدەرە

گەنجەکەیدا دەستیان تێکەڵ کردووە فزە ناکا • لەوە دەترسێ ناوی بزڕێو دهۆڵی ناوبانگی بدڕێ • کچێکیشی هەیە لە کابرایەکی خاوەن ژنو مـــاڵ ناوسە • بۆ پێشگیریی ناوزڕانو ریسوایی ، بەوە قایل دەبێ کــە بە دەستـــی خۆی منالی کچەکەی پێ لەباربەرێ • کچە لەسەر کاسـەی منداڵ لەباربردن دەمرێ ، پرۆفیسۆر دەخرێتە بەندیخانەوە • پاش لە بەندیخانە دەرچوونـی ، لەبیردەچێتەوە • بۆکوێ بچێ ، لەکوێ بگیرسێتەوە ؟ تەنیا جێیەك دەبـێ ، ئـەویش ئـەو قاوەخانە سەباحچی‌یانەن کە پەناو دەرەتانی پیاوی لەبیرکراون • ئینسانەکان لە پیەسەکەدا هەندێ زۆر لایەنترن ، پێم‌وایە ئێکجار وا بێ‌سەروبەر نین وەکو لێرەدا باسم‌کردن • نوسخەی دووەمی ئەمەیشیان ئەمە دوو ســاڵـە لە گەلێ شوێن بەتایبەتی لە شانۆی ئۆردووی سۆڤیەت یاری دەکرێ • لــــە ئەڵمانیای دیموکراتو چیکۆسلۆفاکیاش یاری‌کرا • تەماشاکردنەکەیمان لەگەڵ ئاکتەریستێکی شانۆی هونەریی مۆسکۆ لە ئەستەموڵ بەنسیب بوو • ناوەکەیم لەبیرنەماوە ، لە بیستەکاندا شووی بە کاك فوئاد جاریم کردبوو ، باشکاتبــــی باڵیۆزخانەی تورك بوو ، لەگـــەڵ ئەودا هاتبوو بــۆ تورکیا • پێم‌وایە لـــە سی‌یەکاندا بــۆ یاری‌کردنی دەورێك بــۆ ماوەیەك بــۆ مۆسکۆ گەڕایەوە • ئێستاش لەپێش چاومە : ژنێکی باڵا بەرزی باریکەلە ، چاوەکانی زۆر رەش‌و گەورە بوون ، تا بڵێی جوانی‌یەکەی سەیر بوو • ئێکجار ژیرو ئاقڵ بــوو • پێویستە تەلەفۆن بۆ شانۆی هونەریی مۆســکۆ بکرێ بۆئـەوەی ناوەکـــەی بزانری[٧] • پیەسەکەیش‌و یاری‌کردنەکەشی پەسەندکرد • قەتم لەبیرناچێ : گوتی ئەمە بکەن بە رووسی‌و بۆ شـــانۆی هونەریی مۆسـکۆی بنێرن • بڵێ چیم بەبیرهاتەوە ؟ تەماشاکەن : رۆژێکیان لە باخچەکەی ماڵی کاك فوئـــــاد دانیشتبووین ، من بووم ، کاك فوئـاد بوو ، ژنەکەی بوو ، کوڕە پێنج شـــەش ساڵانەکەیان بوو ، کوڕەکە بە ڕاکردن دەیویست لــە چاڵێك بپەڕێتەوە یەك

---

(٧) ناوەکەی سۆهاچێڤا بێلینا گییۆپیەڤنایە • (ئیبراهیم تاتارلی) •

دوو جار هەوڵی‌دا نەیتوانی‌و هەموو جارێ دەگەیشتە چاڵەو رەق ڕادەوەستا •
دایکەکەی چوو بۆ لای کوڕەکەی ، پێی‌گوت باز دە • مادام دەتەوێ
بپەڕیتەوە دەبێ باز دەی ، نابێ بگەڕێیتەوە • کوڕە گوتی :

– دەترسم دایە •

دایکی گوتی :

– هیچ شتێ لە ترس شوورەیی‌تر نی‌یە لەم دنیایەدا • باز دە • باز نەدەی
دەکەویتە چاڵەکەوە • پێت ناخۆشە ، قەی ناکە ، جارێکی تریش باز دەدەیتەوە •
باز دە ، دەی ••

کوڕە بازی‌داو لە چاڵەکە پەڕی‌یەوە •

لە (١٩٣٨)دا کەوتمە بەندیخانەوە ، ئەم جارەیان (١٣) ساڵی رەبەقی
تێدابووم • لە ژوورەوە پێنج پیەسم نووسی : « شیرین‌و فەرهاد » یا «چیرۆکی
دڵداری‌یەك» ، «یۆسف‌و زلێخا» یا «یۆسف‌و براکانی» ، «ئێستگە» ، «فیتنەت» ،
«بوومە لەرزە» ، لەم پیەسانە «شیرین‌و فەرهاد» لە مۆسکۆ ، لە پراگ ، لە
بەرلین‌و لە زۆر شاری‌تر یاری‌کرا • «یوسف‌و براکانی» لە ئەڵمانیای
دیموکرات‌و چیکۆسلۆڤاکیا یاری کرا • «شیرین‌و فەرهاد» کرا بە فیلمیش •
بەڵام تا بڵێی شتێکی بەربادو قۆڕ هەرچەند بەبیرم دێتەوە تائێستاش شەرمەزاری
دەمگرێ • هەرچی «بوومەلەرزە»و «فیتنەت» بوون دەسنووسەکانیشیان نەمان‌و
لەگەڵ وون‌بووان تێکەڵ بوون • «ئێستگە» بابەتەکەیم گرت ، سەرلەنوێ
نووسیمەوە • بەڵام لە هیچ‌کوێ نەخرایە کایەوە •

گوتمان دەنگ مەکە ئەمەریکاەان دۆزی‌یەوەو کارێك هەیە • زۆر جار
کارێکی فرە سەمەرەو کۆمیکە • هەندێ جار لات‌وایە بەڕاستی ئەمەریکا
نەدۆزراوەتەوەو زۆر بەڕاستی تێ‌هەڵدەچی‌و دەڵێی دۆزیمەوەو زۆرت کەیف
پێ ساز دەبێ • کاتێ دەکەوی‌یە وشکانی تەماشا دەکەی ئەورووپایی‌یەکان زۆر

لەمێژە زەوی یەکەی دەکێڵن ، جا ئەوسا شتەکە نەك هەر سەمەرەیەو بەس ، بەڵکو هەندێکیش جێی تووڕەیی‌و کەف‌چەراندنە • منیش لە مەیدانی دراما نووسیندا کارێکی دۆزینەوەی ئاوهام بەسەرهات • پیاو لە بەندیخانەدا ، ئەگەر بەندیخانە لەسەر بنەمای کارنەکردن دامەزرابێ وەختی زۆرە • بەڵام ئەگەر لەسەر بنەمای کارکردن دامەزرابێ پێم‌وایە لەتاو ماندوێتی‌و شەکەتی ، پیاو وەختی بیرکردنەوەی بۆ نامێنێتەوە ، بەڵام من لە هەر بەندیخانەیەکدا بووم ، وەکو لە بیرکردنەوە بەولاوە هیچ کارێکی‌دیکەم نەبێ وابوو • تەنیا پێنج ساڵی دوایم نەبێ کە توانیم دەس لە ملی بەختەوەریی تەون فێربوون کەم •

لە پەسە هاوچەرخەکاندا تەماشام‌کرد مۆنۆلۆگەکان بەجاری هەڵگیراون‌و لەئارادا نەماوون • گەشەپێدانی مۆنۆلۆگەکان‌و لە دەروویەکی نوێوە کار تێکردنیان ، دەورێکی سەرەکی لە شانۆی دیوی ناوەوەی دنیاماندا دەبینن • لە «شیرین‌و فەرهاد»دا هەوڵم‌دا ئەم ئیبداعەم بەدی‌بێنم • هەروەها لە« یوسف‌و زلێخا»شدا هەستم بە کەیف‌خۆشیی عەینی کەشف‌و ئیبداع کرد • لە «شیرین‌و فەرهاد»دا قارەمانەکان لە سەرێکەوە لەگەڵ یەکدا قسەدەکەن ، لە سەرێکی‌ترەوە بیرەوەری‌و بەسەرهاتەکانیان نەك هەر خۆیان بۆ تەماشاکەرانیشیان دەگێڕایەوە ، هەندێ جاریش بۆ ماوەیەکی درێژ هەریەکە بە دەنگێکی بەرز بیریشی دەکردەوە !؟• لەپاشان هەندێ‌جار قارەمانەکان هەریەکە خۆی لەگەڵ خۆیدا قسەی دەکرد • واتە بە پێودانی مۆنۆلۆگی کلاسیك • لەدووایدا لە «یوسف‌و زلێخا»دا زلێخا دەنگی لە سێ ئاوازدا ، سێ مۆنۆلۆگی جیاجیای دیوی ناوەوەی دنیای خۆی دەگێڕێتەوە • بێ‌ئەوەی زلێخا قسە بکا بە شێوەی پانتۆمیما یاریی‌دەکرد • ئەو سەردەمانە هێشتا (ماگینتۆفۆن ـ مسجل) دانەهاتبوو ، بەڵکو هەشبووبێ ، من بێ‌خەبەر بووم • لەبەرئەوە بیرم‌کردەوە ئەم سێ دەنگە لەسەر قەوان تۆمار کەم • بەڕاستی هێندە لەم کەشف‌و ئیبداعانەم مەمنوون بووم ، هەرکە لە بەندیخانە دەرچووم‌و دەرنەچووم ، یەکەم

کارم ئەوەبوو ئەم دوو پیەسەم بـۆ هاوڕێکانم بخوێنمەوە • بۆمخوێندنـــەوەو بە «پێکەنینێکی ساردو بێ تامەوە» تەماشام کردن • یەکێکیان گوتی :

ــ چاکە ، بەڵام ئەم ماریفەتەی تۆ ، بگرە هەرە پۆپەکەشی سارتەر لە مێژە کردوویە •

یەك لە خراپیەکانی پۆستنشینیی بەندیخانە ئەوەیە کە درامانـــووس ئاگای لە سەرلەبەری کەینو بەینی مەیدانی درامانووسی دەبڕێو وەکو لـــــە گوێی گادا نووستبێ وای لێ بەسەردێ • بەڵام دنیا هێندە گەورەو فـــرەوانەو درامانووس هێندە زۆرو زەوەندەن شەرتنییە تەنیا هەر پۆستنشینیی بەندیخانە ببێتە هۆی بێخەبەری لە کەینو بەینی مەیدانی درامانووسی •

یانی بەکورتیو کوردەوارییانە ، بـــۆئەوەی لە کاروباری شانۆسازیدا سەرلەنوێ ئەمەریکا بدۆزییەوە ئیللانو بیللان چوونە ژوورەوەی بەندیخانەی ناوێ • هەروەکو لەپاش ئەوەی هاتم بـــۆ مۆسکۆ بە نووسینی یـــەك دوو پیەسیش عەینی بەزمم بەسەرهات ، یانی وامدەزانی ئەو ماریفەتو کەشفانـــەی کە من لە پیەسەکانمدا ــ هەندێکیان یاریش نەکران ــ دامهێناون بە خەیاڵـــی کەسی دیکەدا نەهاتوونو تەنیا هەر خۆم شۆڕەسواری ئـــەو مەیدانەم ، کەچی لەدواییدا بۆم دەرکەوت هەیهوو ، ئەم ماریفەتانە زۆر لەمێژتر بەکارهێندراون • لەمانەی عەرزمکردن ئاکامو ئەنجامێکی ئاواوایی وەدەست دێنم :

ئینسان لە سەردەمە کەوشەندارەکاندا ، لە هەر پیشەیـەکی بەتخووبدا ، لە بلیمەتەکەیەوە بگرە تا نەفەرێکی ساکاری ، لە زانستدا ، لە تەکنیکـــدا ، لە هونەرە جوانەکاندا ، لە هەرچییەکدا لە سەرانسەری ئەم دنیایە ، تەنانەت لە بەندیخانەشدا ، رووبەرووی عەینی ئەم پرسیارانە دێو هـەر عەینـــــی وەڵامیشیان دەداتەوە ، گەورە ، بچووك ، زۆر گرنگ ، کەم گرنگ ، هەر عەینی ئەو کەشفانە ، هەر عەینی ئـەو ئیبداعانە دەکا ، زۆر جار بێئەوەی کەس

ئاگای لە کەس بێ ئەمانە دەکەین ٠ بەم ئەنجام گەیشتنە لەسەرێکەوە دڵخۆشیی خـــۆم دەدەمەوە ، لە سەرێکیتریشەوە وەختە بڵێم ئەمە جۆرێکە لە بابەتـــی سەرلەنوێ ئەمەریکا دۆزینەوەیەك ٠٠٠

ئـــا ، لەبیرم‌نەبوو ، پاش بـــۆ مۆسکۆ گەڕانـــەوەم ، برێ پیەسم نووسی : « لە تورکیا » ، نوسخەی دووەمی « هەرە گێـــل » ، « ئیڤان ئیڤـــان ئیڤانۆڤیـــچ هەبوو نەبوو ؟» ، «مانگا» ، «سەرگێشی دووەم» ، تارتۆف ــ ٥٩» ، «سەرەڕای هەموو شتێ» ، «سەعاتەکانی پراگ» ، «شیرەکەی دیمۆکلیس» زۆریـــــــــان نەخرایە کایەوە ٠ بەڵام ئەو چاکتر ٠ بەدرێژایی ژیانم لەژێر تەئسـیـــــــری شانۆدا بووم ، بەڵام لە درامانووسێکی دەرەجە سێ بەرەوژووورتر سەرنەکەوتم، بەڵام هەرچۆنێك بێ لەم مەسەلەیەدا بێ‌بڕشت‌و خراپ نیم ٠ هیوادارم بـــــم بە درامانووسێکی چاك ٠ قسەی پێشینانە : «تا ڕۆح زیندوو بێ نومێدبڕ نابێ»(*) ٠

**ناظم حیکمەت**
**نیسان ــ حوزەیران**
**١٩٦٢**

---

(*) ئەم وتارە لەلایەن وەرگێڕەوە لە یـــەکێ لـــە کۆڕەکـــانی یەکێتیـــی نووسەرانی کورددا لە هۆڵی کۆمەڵـــەی کولتووری کورد لە بەغـــدا خوێندرایەوە ٠

# دەنگێکی باشکێن

عەبدوڵڵا پەشێو

با دێ !
با دێ !
دیسان ئاستانەی خەلیفە
هەڵیکردووە
بە ناوگەڵی فتوای مەلای خەتێدا دێ !

★ ● ★

با دێ !
با دێ !
گوێتان لێیە ـ
چۆن داربەڕوو دەنرکێنێ ؟!
چاوتان لێیە ـ
چۆن کەپکە شاخ بەلادا دێ ؟!

★ ● ★

با دێ !
با دێ !
دەست بە ئابڕووی خۆتانەوە بگرن ؟ خەڵکە
ـ ئەگەر تۆزێ ئابڕوو مابێ ! ـ
نەك هەر کڵاو ،
با سەریشمان پیرۆزی باو ڕەشەبا بێ !

مۆسکۆ
٢٣ ـ ٦ ـ ١٩٧٧

# خوسرەوی گوڵسورخی

## ئەوشاعیرەی مەرگ لە بەردەمیا چۆکی دادا

ئەنوەر قادر محەمەد
لە فارسی‌یەوە ئامادەی کردووەو
شیعرەکانی کردوە بە کوردی

تۆ کۆچت کرد ..
شار بۆت سووتا
باخ بۆت سووتا ..
بەڵام ئەو دوو دەستە شەنگەت
« مژدەی سبەی » ..
هەموو سالێ سەوز ئەبێت‌و
ڕووی هەموو خاك دائەپۆشێ
چڵی پڕ شنە دەرئەکا ..
گوڵ دەرئەکا ..
گوڵێ یەژی خوێنی سوورە .

« گوڵسورخی »

گوڵاڵە سوورەکانی ئێران سوورتر بوون ، لە نەزۆکترین وەرزی مێژوودا ، کام شەهیدە کە گوڵاڵە سوورەی ئێمە ئەلاوێنێتەوەو سروودی بۆ ئەڵێ ؟ خەڵکی لای ئێمە گوڵی سوور بە ڕەمزی شۆڕش ئەزانن ، وەنەبێ ئەم هەڵبژاردنە تەنیا لە ڕەنگە سروشتی‌یەکەی گوڵی سوورەوە هاتبێ .. جگە لەوەش هۆیەکی پڕ جۆش‌و خرۆش‌و ئەندێشەی‌تریشی هەیە .

بەربەیانێ خوسرەوی گوڵسورخی شاعیری شۆڕشگێڕ .. شاعیری جەماوەری خەڵك ، لە مەیانی مەرگدا بە باوەڕێکی بەهێزی واوە کە هەموو

ولاتی ئێمەی کردبووە بەهاروداپۆشیبوو •• بەڵێ ! ئەو بەیانی یە «سەرو »ی سەرفەرازی‌و ئازادیی میللەتی ئێمە وەك هەموو ئازادیخوازێك وەستاو مرد •• مردو لە دڵی هەموو هاونیشتمانێکی ئێمەدا گوڵێکی سووری پڕجۆش خونچەی کردو کرایەوە •

شاعیرێکی‌وا کە هەڵوێستی ڕۆژانەی‌و قسەکانی‌و بەرهەمەکانی نەك هەر جووت کردبوون ، بەڵکو هەر ئەو بیروباوەڕە گەرم‌و بەجۆشەی بوو گەیاندیە ئەو سەرەنجامەو گیانی پاکیشی لەپێناودا بەخشی •

ئەو لە دڵی میللەتەکەیدا وەك ڕەمزێکی گەورە ئەمێنێتەوەو ئەبێتە سەرمەشق بۆ هەموو میللەتان‌و شاعیرانی‌تری دنیاش •



مامۆستای «ئینشا» داوای لە قوتابی‌یەکانی کرد باسێك دەربارەی قارەمانێکی مێژوو بنووسن •• یەکێ لە قوتابی‌یەکان دەستی‌کرد بە خوێندنەوەی ئەو شتەی کە نووسیبوی :

«قارەمان ئەبێ دۆستی خەڵك بێ ، لە مەرگ‌و مەترسی نەترسێ ، قارەمان ئەبێ وەك خوسرەوی گوڵسورخی بێ » •• مامۆستاکە ناچاربوو قسە بە منالەکە ببڕێ‌و بە لێوەلەرەوە بڵێ :

— کێ پێی‌وتی قارەمانی مێژوو ئەبێ وەك گوڵسورخی بێ ؟
قوتابی‌یەکە بێ‌پێچ‌و پەنا وتی :

— من لە باوکم پرسی ، بابە کێ قارەمانی مێژووە ؟ ئەویش وێنەی گوڵسورخیی لە ڕۆژنامەکاندا نیشان‌دام‌و وتی ئەمەیە قارەمان !

لەم گفتوگۆیەدا بوون لە ناوەڕاستی پۆلەکەوە قوتابی‌یەکی‌تریش پەنجەی هەڵبڕی‌و وتی :

ـــ مامۆستا ئێمەش هەر دەربارەی گوڵسورخیمان نووسیوە ••
گوڵسورخی شاعیرێ بوو ، ئەیویست شیعرەکانی «بەرگی شەڕ لەبەر بکەن ، تفەنگی پێشمەرگەیەك بکەنە شان » • ژیانی سەرمەشقی شیعرەکانی بوو :

**ئێمەین •• ئێمەین**
**ئێمەین بە خوێن خەنجەری نووستووی ناو خوێنمان**
**بە باوەڕی گۆشتو گوللەو بە خوێنو بە ڕیزی هاوار**
**باغی گەورەی موژدە ئەگرین**
**ئێمەین •• ئێمەین ••**

گوڵسورخی بوو ئەیوت نرخو بایەخی ڕۆشنبیریمان وەك کاو جۆ مەڕێژن•• چۆن ئەبێ شیعر دروشمی ژیان نەبێ ؟ لەکاتێکدا کە ژیان ژیان نییەو کولەمەرگییە •• گوناهێکی زۆر گەورەیە ، سۆکەسۆك بکەوینە دوای شیعری گەوهەریو ڕووتیوا کە دوور بێ لە ژیان • من بۆ گۆڕینی ژیان نەك ئەمەوێ شیعر دروشم بێ ، بەڵکو ئەمەوێ خەنجەرو پەتو ژەهرو گوللەو مشتەکۆڵەش بێ ••

گوڵسورخی لەگەڵ کۆمەڵە لاوێکی شۆڕشگێڕدا ناسیاویی پەیداکردو ئەم دۆستایەتییەی شۆڕشو گۆڕانێکی گەورەی بەسەر بیروباوەڕیدا هێنا • گوڵسورخی ئەیوت :

« کارێ کە ئەم پارتیزانانە ئەیکەن درێژە پێدانو وەجاخ ڕۆشن کردنەوەیەکی گەورەو داهێنەرانەی لینینیزمە •• ئەگەر (لینین) ئەمڕۆ لەگەڵ ئێمەدا بژیایە پەلاماری ئەدایە تفەنگێکو هەڵی ئەگرت •••» •

هاوڕێیەکی توودەیی لە وتووێژێکدا دەربارەی ئەم بیروڕایەی بە گوڵسورخیی وت :

« با لێنین بە شتێکەوە ناو نەبەین کە ڕەنگە پێی ناخۆش بێو بیرو ڕای وا نەبــێ » •

لەگەڵ ئەم هاوڕێ توودەیی‌یەدا وتووێژو قسەیەکی زۆر کەوتووەتــە نێوانیان •• هەرچەندە گوڵسورخی بەتەواوی باوەڕی بە قسەکانی توودەیی‌یەکە نەهێنا ، بەڵام ئــەو هــەر کاری تێ‌کردو هانی‌دا بۆ بیرکردنەوەو گــەڕان بە شوێن ڕێگایەکی ڕاستو تەواوا •



لەپڕ گوڵسورخی گیرا ، خۆی چاوەڕوانی ئەو گرتنە نەبوو ، نــەو لە گێژاوێکی فیکری‌و دەروونیدا ئەژیاو سەیری دەوروپشتی خــۆی ئــەکــردو هەنگاوی ئەنا •• نزیکەی ساڵێك بوو پێوەندی بە کۆمەڵەیەکی بچکۆلــەی مارکسی‌یەوە بڕیبوو بەدوای ڕێگەیــەکی تازەدا ئەگەڕاو هیچ باوەڕێکی بــە کۆمەڵەی پێشوو نەمابوو ، نەك هەر پێوەندی لەگەڵدا پچڕیبوو ، بەڵکــو زۆر ڕقی لەو کافێو بارو چاخانەنشینانە ئەبوەوەو ئەیوت :

« کاتێ قسەو لاف‌لێدان لەناوا بێ ، لە (لێنین) بەلشەفیك‌ترن ، بەڵام کاتێ پێیان‌ئەڵێن هاوڕێ ! دەی وەختی هاتوە ! ئەمە گۆو ئەمەش مەیدان ! زمانیــان ئەشکێو دەستێکیان ئەکەوێتە ئەملاو دەستێکیان ئەکەوێتە ئەولا •• لەپڕ لــە لووتکەی لاف‌لێدانو خەیاڵ پلاو دێنە خوارەوە ، هەزار کەڵەكو کوڵــەکــی لەفزی‌و سەفسەتائی دێننەوە بۆئەوەی خۆیان دەرباز بکەن » •

گوڵسورخی کاتێ پێوەندی لەگەڵ ئەو کۆمەڵە مارکسی‌یە پەیداکرد ، خۆی بــۆئەوە ئامادە کردبوو کە بەناو ئاگرو دۆزەخو گەرداوا هەنگاو بنێ ، خــۆی بدا بەدەم هەموو کارێکی شۆڕشگێڕانەوە کە پێی بسپێرن •• هــەر بۆئەوەش کە کوڕە تاقانەکەی‌و «عاطیفە»ی ژنی لە گیروگرفتو ڕاوەدوونانی «ساواك» ڕزگار بکات بەنهێنی پەیمانی لەگەڵ عاطیفەدا بەستبوو ، وای‌دەرخەن

لای خەڵك کە گوایە خەریکن لەیەك جیائەبنەوە • عاطیفەش پێوەندی‌یەکـــی بەو کۆمەڵەوە بووە •• دوای ئاشکرابوون‌و گیرانی ئەندامانـــی کۆمەڵەکـــە «خوسرەو» گیراو عاطیفەش گیراو بـۆ چوار ساڵ خرایە زیندانەوە •• شایانی باسە «عاطیفەی گورگین» لە شاعیرە ناسراوەکانی ئێرانە •

گوڵسورخی ئاوێنەیەکی ڕوونی شیعرەکانی خـــۆی بوو ، شیعرەکانـــی شیعری بەرهەڵستی‌و بەرگری بوون ، خۆشی هەروەهابوو ، ئەو هەواڵانـــەی لە زیندانەوە لەوانەوە ئەبیستران کە لەگەڵیا بەنـــد بـــوون •• گیانـــــی شۆڕشگێڕیەتی‌و ئازایـــەتیی ئەو بە خەڵك ئەگـــەیـــەنن •• هاوزنجیرێکـــی گوڵسورخی دوای بەردانی گێڕاویەتەوە وتوویەتی :

« کاتێ خوسرەویان ئەبرد بـۆ لێدان‌و ئازاردان ، لەگەڵ ئەوەشـــدا کە قاچ‌و قولی شوێنی سەدان قامچی‌ی پێوەبوو ، هەوڵی ئـــەدا بەپێوە بوەســـتێ ، نەی‌ئەهێلا زیندانەوانەکان بچنە ژێر باڵی‌و کۆمەکی بکەن •• دانەکانـــــی چێڕ ئەکردەوەو بڕۆکانی کرژئـــەبوون‌و سنگی ڕووتی ئەدرەوشایەوە • بـــەم باڵاو ئالاییە پڕشکۆو پڕزام‌و ئازارەوە هەرچەندە بۆشی ئەشەلی ، بــــەلام ئازایانە هەنگاوی ئەنا •••»

هەر ئەم هاوڕێیەی درێژەی بە قسەکانی داوەو وتوویەتی :

« گوڵسورخی هەر هەلێکی دەسکەوتایە ئەچووە لای هاوڕێکانـــــی‌و ورەیانی بەرز ئەکردەوە •• گوڵسورخی هەر لەبەر ئـــــەوەی سەرکەش‌و سەرگەرم بوو لە سێدارەیان دا ، تەنانەت ئەو تۆمەتەی دابووشیانە پاڵی تۆمەتێکی ئەوەندە گەورە نەبوو » •

یەکێکی‌تر لە هاو زیندانەکانی گوڵسورخی ئەڵێ : « گوڵسورخی زۆر هانی ئەوکەسانەی ئەدا کە تازە ئەخرانە ژێر ئازارو لێکۆڵینەوەو لێ‌پرسینەوەو ورەیانی بەرزئەکردەوە ••دەستە پڕ زام‌و خوێنەکەی پیشان‌ئەدان‌و پێ‌ی ئەوتن:

« با له (كه‌تیرائی) و (رۆزبیه)ه‌وه فێر ببین » •

گوڵسورخی رۆزبیهی به قاره‌مانی خۆشه‌ویستی خۆی ئه‌زانی •• ئـــه‌و چه‌ندین جار وتوویه‌تی : « ته‌نیا رۆزبیهێك بـــۆ خۆش بوون له هه‌مـــوو رێ ده‌رنه‌كردنو نه‌زاندوویه‌تیی حیزبێك به‌سه » •

له دادگادا له‌وكاته‌دا زۆر له‌وانه‌ی گیرابوون ئه‌رووخانو ئه‌تلیسانه‌وه‌و بیروباوه‌ڕو هه‌موو ڕابووردووی خۆیان ئه‌دا به‌ده‌م بای سه‌رشۆڕی‌یـــه‌وه •• له‌و وه‌خته‌دا كه زوربه‌یان سه‌ریان ئه‌نه‌واندو چه‌كمه‌یان ئه‌لێسته‌وه •• هـــه‌ر له‌وكاته‌دا نه‌ڕه‌ی گوڵسورخی وه‌ك گرمه‌ی برووسكه له دادگاكه‌داو له‌گوێی ڕۆژنامه‌نووسانی هه‌ندرانو ناوخۆدا ده‌نگی ئه‌دایه‌وه :

**ـــ به ناوی ئینسانه‌وه •• به ناوی خه‌ڵكه‌وه ••**

ئه‌م ده‌نگه له ته‌قینه‌وه‌ی نارنجۆكێك كاریگه‌رتر بوو • دوایی ئه‌یووت :

**ـــ من له دادگایه‌كدا كه باوه‌ڕم نه به قانوونیه‌تو نه به ده‌سه‌ڵاتی هه‌یه ، هیچ داكۆكی له خۆم ناكه‌م • من وه‌ك ماركسی‌یه‌ك ڕووم له میلله‌تو له مێژووه • چه‌نێ ئێوه به‌دواما ڕابكه‌ن من زیاتر خۆم دوورئه‌خه‌مه‌وه ، چونكه چه‌نێ لـــه ئێوه‌وه دووربم ، ئه‌وه‌نده له خه‌ڵك نزیكترم • چه‌نێ ئێوه ڕق‌و كینه‌تان به‌رامبه‌ر بیروباوه‌ڕه‌كه‌م هه‌بێ ، سۆزو خۆشـــه‌ویستی‌ی میلله‌ت بۆ من زیاتر ئه‌بێ •• ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر بشمخه‌نه گۆڕه‌وه ـ وه‌ك نیازتان وایه ـ خه‌ڵك له لاشـــه‌ی من ئاڵاو سرووود دروست ئه‌كات •**

سه‌رۆكی دادگا بـــه لێدانی زه‌نگ قسه‌كانی به گوڵســـورخی بڕی ، سه‌رهه‌نگێكی‌تر ئه‌یویست به شێوه‌یه‌كی زبرو وشك قسه‌ی تێگرێ‌و بێده‌نگی بكات ، گوڵسورخی به ته‌وسێكه‌وه زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌ك گرتی :

**ـــ له قسه‌كانی من ئه‌ترسیت ؟**

سه‌رۆكی دادگا به تووڕه‌یی‌یه‌وه هاواری‌كرد :

ـــ من پێت‌ئه‌ڵێم كه بێده‌نگ بیت‌و دانیشیت • چاوه‌كانی گوڵسورخـــی

پڕبوون لە گڕو خوێن ، چریکەو هاواری تا ئەهات بەرزتر ئەبـــووەوە ..
« فەرمان بەسەر مندا مەکە .. بەسەر دەستو پێوەندەکانتیا بکە ، وا نازانـــم
دەنگم ئەوەندە بەرز بێ ویژدان نووستوویەکی وەك تۆ بێدار بکاتەوە ، مەترسە !
ئەبینی کە لەم دادگا ناڕەوایەدا .. تا لێرەشدا سەری نێزەو سوونتی پارێزگاریتان
ئەکات » . لەم کاتەدا دەستی بـــۆ ئەو سەربازانە ڕاکێشا کە لە دەوروپشتی
داوەرەکانەوە وەستابوون ..

کاتێ دادگا فەرمانی مەرگی بەسەر گوڵسورخیو (دانشیان)دا دا ، تەنیا
ئەو دووانە بە پێکەنینـەوە دەستی یەکتریان بەگـەرمی گوشیو باوەشیان بـــە
یەکتری‌دا کرد .. گوڵسورخی وتی :

**ـــ هاوڕێ !**

دانشیان دووبارەی کرەوە :

**ـــ ئەی بەنرخترین هاوڕێم !**

ڕۆژنامەنووسو دەرهێنەرانی تەلەفزیۆنو هەموو ئەوانەی ئامادەکرابوونو
بەتەمابوون شانۆیەکی باشیان لێ پێك‌بێنن ، نائومێد بوونو تەڵەکەکـــە سەری
نەگرت .

نۆرەی قسەکردن هاتەوە سەر گوڵسورخیو ئەویش ئەیویست هەوێنو
پوختەی ڕازی بوونی خۆی لە کەمترین وشەدا دەربڕێ .. بێ‌دەنگی‌یـــەك
بوو ، دوایی برووسکەکە کەوتەوە ناڵەناڵ .. زایەڵەی دەنگی گوڵسورخـــی
وەك داهاتوو پیرۆزو رۆشن بوو :

**ـــ هەموو خەڵکی ئێران ئەبێ ئەوە بزانن ، من لەبەرئەوە کە مارکسیمو هەڵگری بیروباوەڕی مارکسیزمم ، بۆیە فەرمانی مەرگم دەرئەکەن . تاوانی من هیچ شتێکی‌تر نی‌یـــە جگە لە بیروباوەڕەکـــەم . من لـــەم دادگایەدا کـــە ڕۆژنامەنووسانی هەنەرانیشی تیا ئامادەن ، ڕووی دەم ئەکەمە ئەوانو لـــە گاڵتەجاڕیو فێڵو فڕی ئەم فەرمانە ناهەقە ئاگاداریان ئەکەمەوە .. مەبەستیشمە هەمووکەس ئاگای لەمە بێت .. من تەواوی کومێتەو کۆمەڵە ماف‌ناسەکانـــی**

**جیهان لەم مەسەلەیە ئاگادار ئەکەم ٠٠ من پێتان ئەڵێم ئەم دادگایە هەر هیچ نەبێ ئەوەندە خۆی ماندوو نەکردووە تەنانەت دۆسیەکەشم بخوێنێتەوە ٠٠ من کە ئینسانێکی (مارکسی - لێنینی)م و ڕێزم بۆ ئیسلامیش هەیە ، بە دەنگی بەرز ئەڵێم و هاوار ئەکەم کە لە هیچ کوێیەکی ئەم دنیایەدا لە وڵاتێکی دیل و پڕ چەوسانەوەدا حکوومەتی میللی دروست نابێ و ، ئەگەر دروستیش بێ ئەبێ هەر لەسەر بناغەی مارکسیزم دروست ببێ ٠**

دوا داو کە بۆ گوڵسورخی نرایەوە ئەوەبوو کە «داموون»ی کوڕە تاقانەی پێ ببینن ٠٠ لەگەڵ ئەوەشدا هەموو شاڕەگ و دەمارەکانی پڕ بوون لە خۆشەویستیی «داموون» ، بەڵام وتی : «نە ٠٠ نامەوێ ببینم » ، چونکە ئەیزانی تەنیا داموون ئەتوانێ کار لە شوورەی سەرسەختی و سەرگەرمیی ئەو بکا ٠ وتی : «نە» ٠٠ بۆیە تاقانە کوڕەکەی نەدی و بەو سەرە بەرزو سەرکەشەوە سەری نایەوە ٠٠

کە خوسرەویان بە یەکێ لە دار سێدارەکانەوە ئەبەستەوە ، ئەو هەر پێئەکەنی ٠ «دانشیان»ی هاوڕێیان پێش ئەو بەدارێکەوە بەستبۆوە ، ئەیانویست دەستەسڕێکی سپیی لە چڵکا زەرد هەڵگەڕاو بەچاویەوە ببەستن ٠ خوسرەو ڕووی تێ کرد :

**ـــ ئەترسی ؟**

(دانشیان) شانێکی بۆ هەڵتەکاندو وتی :

**ـــ وەختی ئەوەم نییە بیر لە ترس بکەمەوە ٠**

گوڵسورخی بە عەشقێکی سەیرەوە خەریکی هەڵمژینی شنەی بای بەیان بوو ، سەربازەکە چاوی (دانشیان)ی بەستەوەو هات بۆ لای ئەم ٠٠ ئەمیش وتی :

ـــ برا ! چاوی من مەبەستەوە ٠ من ئەمەوێ سەیری تیشکی هەتاو بکەم ٠٠ بە نیگای چاو سەیری ئاسمانی ئەکرد ٠٠ تیشکی ئاڵی هەتاو تازە بە سپێدەی بەیانیدا ئەپرژاو بڵاوئەبۆوە ٠٠

**« چریکەم ئەم دیوارانە ئەڕووخێنێ • ئێوە ناتوانن چریکەم وەك لەشـــی ڕێژە ڕێژەکراوو زامارم لە خاکدا بشارنەوە » •**

باڵای «داموون» وەك سێبەرێکی ترسناك باڵی بەسەر مەیدانەکەدا دادابوو ، پەلکەکانی «عاطیفە» لە مەیانی «تیرچینگر» بەدەم شنەبای بەیانەوە شەپۆلیـــان ئـەدا •

ڕووی لوولەی تفەنگیان کردە سەر دڵی گوڵسورخیو گوللەکان وەك پەلەوەری ئاگرین ئەفڕینو گوڵاڵە سوورەی سەر سینەیان ئەکردەوە •

کاتێ پەڕەی ژیانی خەباتکەرێ ، شۆڕشگێڕێ هەڵئەوەرێتە ســەرخاك ، ئەم خەڵکە چۆن ئەتوانن بە ساردو سڕی لە شەقامەکاندا بێ‌گوێدان بە ژیـــان هەنگاو بنێنو خەریکی سفرە ڕازاندنەوە بن ؟؟

دوای گوللەبارانی گوڵسورخی کەوتنە کۆکردنەوەی ئەو بەرهەمانەی کە بە ناوی خۆیو نازناوی «داموون»ەوە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بـــڵاوی کردبوونەوە ، بەڵام نەیانزانی کە بە نهێنیو نیوە ئاشـــکرا ، کتێبەکـــەی «سیاست هنر ، سیاست شیعر»ی چاپ‌ئەکرێتەوەو لە ماوەی چەند مانگێکدا **(٥٠)** هەزار دانەی لێ ئەفرۆشرێ • ئەمــە تەنیا کتێبێکە جگـــە لە بەرهەمەکانـــی «بیهرەنگی» ئەوەندەی لێ فرۆشرابێت •

## هەندێ پارچەو کۆپلەی هەڵبژاردەی شیعرەکانی گوڵسورخی

**خامۆشی بەسەر دڵی ئەم هێلانەدا کشاوە**
**ئای !! ئای !! کوا ماڵێکی هێمن ؟**
**کوا خانوویەکی‌تر ؟**
**کوا سوورێی هاوارەکانی بابەکی خوڕڕەم ؟**
**کوا کاوەی ئازادیی ڕۆژگارێکی‌تر ؟**

« کجاست سرخی فریادهای بابك خرم »
کوا سوورێی هاوارەکـــانی بابەکی خوڕڕەم
ل ٢٢

ئەبێ خۆشەویستی بفامین ٠٠ یاران !
ئەگەرچی هاوارەکانمان ناگەنە بەرەوە ٠٠
بەڵام ئەبێ ببن بە یەك
ئەبێ وەك « خەزەر » بخرۆشێین ٠٠
ئەبێ سووریی خوێن ببێ بە ئاڵا
ئەبێ دڵمان ببێتە سروودو ئاڵا
ئەبێ هەموو بەیانی‌یەك لە«ئەلبورز» نزیکتر ببینەوە
ئەبێ ببینە یەك
ئەبێ بەهار
لە چاوی منداڵی کەنار شەقامی « ڕەی »دا
تەڕ و سەوز و پاراو بێ ٠٠
ئەبێ ئەو منداڵانە بەهار بناسن ٠

« سرود پیوستن »
سروودی یەکگرتن
ل ـ ٢٢

ئەبێ تیریکی‌تر هەڵگری
ئەبێ لەگەڵ گوللەدا شەڕ بکەی
ئەوەی دڵۆپ ٠٠٠ دڵۆپ
بەسەر بانی غەریبا
بە ڕاڕەوی نەناسراوا
ئەڕژێ ٠٠٠
ئەوە خوێنی ڕژاوی جوانی هاوڕێیانە
ئەی گەرمترین هەتاو !
لەسەر شانمان هەڵبێ
ئەی گەورەترین سەرەتا !
ئەی تفەنگ ! ئەی وەفادار !
هاوڕێمان بە ٠٠٠
تا بڕۆین سبەینێ وەدەس‌خەین ٠

★ ● ★

ئێمە لەناو ئاگرو خوێنا گۆش‌کراوین
سەیری دەستمان بکە ٠٠
ئێمە بە باوەڕی گۆشتو گوللەو مەرگەوە
پێغەمبەرانی ڕووتی ڕەنجو ئازارین ٠٠٠
سەیری دەستمان بکە ٠٠٠ ئێمە ئەوانین ٠٠٠

★ ● ★

ئەو ڕۆژە هەر دێ
کە ئاسمانی باغ بکرێتەوە
هەموو سەروە تێکشکاوەکانی دارستانیش
لە داخی مەردو شەهیدانی خۆیان
بالآیان ڕاست ئەکەنەوە ...
هەموو ئەو دەستە شەهیدانەش
ئەو دەستانەی توانای خۆشەویستی‌یان هەیە ...
ئاسوودە ئەبن ...

★ ● ★

بابە ! ناوی گوڵی سارا
ئەو گوڵانەی خۆشەویستن ...
بۆمان بکە بە ئاوازو بە گۆرانی

★ ● ★

تۆ هەمیشە بێدار بە
هەر هەتاو کەوت
من کراسە سوورەکەی تۆ لەبەر دەکەم
ئەوان زۆر چاك تۆ ئەناسن
تۆ کە ڕۆژگارێکی بێداری
هەموو ڕۆژێ ئەیانکوشتی و ئەیانکوشتی
ئەوان بوون کە هەموو ڕۆژێ
خوێنی تۆیان ئەسڕی‌یەوە ...
بەلآم ئەوان نەیان‌ئەزانی ،
کە کراسە سوورەکەی تۆ
یەك ئەیداتە دەست ئەوی‌ترو ،
بەناومانا هەر گەشت ئەکا .
بابە ئارام بە !
ئێمە ئەمڕۆ تۆ بە خوێن ئەنووسین
هەموو ڕۆژێ تۆ ئەنووسین ...

★ ● ★

ئەو لێرەیە و لە گشت شوێنێ
بەو هاوارو ئاوازەوە ...
تۆ هەر لە شمشاڵی شوان‌دای
بە ئالآی بەرزی مشتتەوە ...

هەر بەڕێوەی ...
سوپاش ئامادەی تۆڵەیە ...
تۆ هەر لە شمشاڵی شوانداى
نەوشێروان مرد .. مرد و چوو بۆ دۆزەخی نەفرەت
تۆ نەمردی ، سەرفراز مای
ئەوان هاتن‌و سەریان بڕیت
تیریان لێدای ...
تۆیان بڕی ..
فڕێیان دای ...
هەر نەمردی ... تۆ نەمردیت‌و هەر نایشمرۆی ...
لەناو بورج‌و شوورەکاندا
خوێنی تۆیە ...
هێنی سۆزە پاکەکەتە
لە شار ... شارا
گڕی ئاگری بێدارین ...
شار لە تۆدا سووتا
نەوشیروانیش سووتا
هەموو شتێ سووتا ... سووتا ...
تۆ نەمردی‌و سەرفراز مای
باغی مژدەت رازاندەوە
تۆ هەر لە شمشاڵی شوانداى و ،
پیاوی باوەڕی ...
تۆ هێشتاکە بەو هاوارو ئاوازەوە
لەناو کووچەو باغەکانی «نیشاپوور»دا
هەر (انا الحق)ە سۆزی تۆ
گۆرانیی تۆ ...



هاوڕێ ئاخۆ بیرت چۆنە ؟
ژیان چییە ؟
مەرگە لەپێناوی عەشقا
یا ژیانی هیچ‌و پووچە
یا ساتێکە لە نێوان مان‌و ڕۆیشتندا

« آوازهای پیکار »
بەستەی خەبات
ل ٢٣ ـ ٣٢

ئەی دوو چاوی گەش‌و پڕ ڕۆشنی !
لەناو ڕووباری سۆزی وتەتا
هەزاران هەزار مەلەو هەڵئەفڕێ
بە بێ تۆ منیش ...
کۆترێکم بێ باڵ ، بە بێ پەڕو پۆ ...
ناتوانم بفڕم ...

« أی پریشانی »
ئەی داماوی
ل ـ ٣٢

کاتێ شەو دێ‌و لە دەرگا ئەدا
بە خۆم ئەڵێم بەیانی بەو هاوڕێیانەم
ئەڵێم کە لە ڕوونی‌دا ئەگرین ...
گریان پیشەی هەورە
من‌و تۆ بە پەنجەی وەك شمشێرەوە
بە حەرفی وەکوو بارووتەوە ...
ڕووتی ناهیلێن‌و ... بە هاوار ئەڵێین
هەتاو هەر بۆ ئێمەیە ...

« فردا »
سبەینێ
ل ـ ٣٤

زامی قووڵی دەستی دوژمن
وا بە تەختی سینەتەوە ...
بەڵام ئەی سەروی ڕاوەستاو
تۆ ڕاهاتووی ئەبێ هەر بەپێوە بمری
گۆرینی خەنجەر و خوێن هیی تۆیە
مەڵێ کۆچ کەو ، ...
سروود و نەغمەی سەرکەوتن
هەر هینی تۆن ..
هەرگیز گیانە !
چاوەکانت بەم شێوەیە ڕۆشن نەبوون ...

★ ● ★

ئەم خەڵکە ..
ناوی مەزنی تۆ

ئەکەن بە سروودی نیشتمانی ...
ناوی تۆ ئالآی ئێرانە
(قەزوێن) بەناوی تۆوە زیندووە

« شعر بی‌نام »
شیعری بێ‌ناو
ل ــ ٣٦

ئەی چاوی ئەو گیایانەی وا ،
سەریان لە خاك دەرنەهاتووە ...
ئاخۆ لێزمەی بارانی ئەم ڕۆژهەڵاتە کەی ئەبینن ؟!
ئەوەیە لە ناو دڵۆپی خوێنی شەهیدەوە
بەتالیۆنی مەلی سپی
خەمنامەی پڕ لە سەرسامی و دیلی ، ئەبەن بۆ بورجی خوێنینی گڕ گرتووی ،
بابەکی خوڕڕەم ...
ئەو بورجەی بێ بەرگری‌یە ...
ئەمە خاکی منە ... کەوا ئەگری
ئەمە خاکی منە ... کەوا ڕووتە
دەمێکە باران نابارێ
ئەی گریانی ئەو هەورانە بۆ کوێ چووە
هەتا ڕووتیی ئەم کێلگانە
بە خوێنی خۆی دابپۆشێ ؟!

★ ● ★

تۆپی زەوی لەکوێوەیە ؟
ئاخۆ لە کوێی ئەم دنیادا من وەستاوم ؟
بە بارێ هاواری نووستوو خوێنینەوە
ئەی خاکی من !
ئاخۆ لە کوێی ئەم جیهانەدا وەستاوم ؟

« سرودهای خفته »
سرووده نووستووەکان
ل ــ ٣٧

★ ● ★

لەشی تۆ زنجیرەی شاخی « ئەلبورز »ە
یەکەمین بەفری ساڵ ، لە هەردوو کێوی پێلووتدا
خەوی ڕووبارێکی وێرانکەر ئەبینێ

له بەهاری هەموو ساڵێکدا
هەرگیز خەنجەری جەللادان ناتوانن
له پشتەوە کارت لێ بکەن
لەشی تۆ دنیایەك چاوە .

« تو »
تۆ
ل - ٣٨

## لەبەر بارانا نووستوو

لەنێوان خەنجەرو دیوارا دەستێ هەیە
لەنێوان خەنجەرو دڵدا دەستێ نی‌یە
بێ پێ بە پێ‌پیلکەکاندا دێمە خوارێ ...

★ ● ★

لەیلام لەودیو پەنجەرەوە
هەموو دەمێ نوقمی خەوە ...
باش ئەزانێ بەرە بەیانیان ،
من بە بێ دەست ئەڕۆم بۆ لای ،
یارم نی‌یە پەنجەرەکەی بکەمەوە !

★ ● ★

ڕەنگی لمی قەراخی عەممان ناچێتەوە
ئەوە گۆناکانی منە ... هەر ئەڵێی دەشتی سووتاوە
وەختێ کە تۆ بە بێ‌پەنا
لەناو دەریادا ئەبینم ...
لەنێوان خەنجەرو دڵا دەستێ نی‌یە .

★ ● ★

تۆ نووستووی ؟
یان بێداری ؟
تۆ ئەتەوێ هەتاو بەری بیبەی بۆ شار ...
هەتاکو ئەو گەڕەکانەی ...
لەبەر بارانا نووستوون گڕ تێ‌بەردەی
تا لە کەناری ڕووبارا چاك بزانن

**ئاگر ٠٠ ئاگر ٠٠ تا هەتایە**
**لەژێر خۆڵەمێشا نانوێ ٠**



**تۆ لە ڕکەی شاخەوە و لە ژێر لێزمەدا ، بۆ دامێن دێی**
**لە کەنارەوە تۆ دێی تا**
**ڕووەو بەیان پەنجەرەکان بکەیتەوە ٠**



**بە ڕەشیی هەردوو چاوی تۆ**
**من ئەمەوێ کە بنووسم ، لە قەراخی ئەم باغەدا**
**دەستێ هەمیشە چاوەڕوانی دەستێکیترە**
**چاوێ هەیە هەرگیز ناچێتە خەو ٠٠٠**

**ل ٣٨**



# قورگی ناوێ

موحەممەدی قازی یەکێکە لە ڕۆشنبیرە کوردە بەناوبانگەکانی ئێران ٠ بە گەورەترین وەرگێڕی فارسی دائەنرێ ٠ لەم ساڵانەدا تووشی نەخۆشی‌یەك ئەبێ لە قورگیدا ٠ قورگی پیشانی دوکتۆر ئەدا ٠ دوکتۆر پاش تەماشاکردن ئەڵێ : مامۆستا ! بەداخەوە ئەبێ قورگت دەربێنین‌و ئیتر لەوەودوا قسەت پێ ناکرێ ٠ جا ئەڵێی چی ؟ دەری‌بێنین یا نە ؟

ئەویش لە وەڵاما ئەڵێ : قورگم بۆچی‌یە ؟ دەری‌بێنە ٠ لەم وڵاتەدا بنیادەم کەی ئەتوانێ قسە بکا تا پێویستی بە قورگ بێت !٠

بەبۆنەی سالّی مندالاّنی جیهانەوە

# چراوگ

چیرۆکی : غسان کنفاني
وەرگێڕانی بە دەستکاری‌یەوە بە شیعر : شێرکۆ بێکەس
ئامادەکردنی بۆ سەر شانۆ : کاوە ئەحمەد میرزا

**حیکایەتخوان :**

هەبوو ‥ نەبوو
لە کۆندا ‥ زوو
پاشایەك بوو
ئەم پاشایە دڵێکی بوو
وەك کانیی ڕوون ،
بێگەردو پاك
لەناو خەڵکا ‥ خۆشەویست بوو
پاشای پیرەمێردی ،
پیاو چاك ‥
هەبوو ‥ نەبوو
ڕۆژ هاتو چوو
بەیانی‌یەك ‥ وەختێ وڵات
لە خەو هەستا
پشکۆی هەواڵێکی ناخۆش
بەسەر دەستو دڵیا چزا :

پاشا مردو •• شار شڵەقا
شار ڕەش‌پۆش بوو
شار ئەوەندەی‌تر غەمگین بوو
چونکە پاشا ••
دوای خۆی تەنیا ،
کچێکی لەپاش بەجێ‌ما
کچ منداڵ بوو •• نەیئەتوانی
حوکم بکا ••
بەڵام پاشا •• وەسیێتیکی
بۆ شازادەی بچکۆلانە •• جێ‌هێشتبوو
وەسێت تەنیا چەند دێڕێك بوو :

**شـــــازادە** « وەسیەتەکە ئەخوێنێتەوە » :

بۆئەوەی بێ‌یتە سەر تەختی
پاشایەتی ••
ئەبێ بڕۆیت خـۆر دابگری
دایگریت‌و •• بیهێنیتە ناو کۆشکەوە
ئەگەر نەیکەی سزای ئەنجام
ئەبێ تا ماویت ژیانت
لەناو سنووقێکی تەختەی
داخراودا ، بەسەربەری •

– تاریکی –

**حیکایەت‌خوان :**

هەر دوای ئەوەی
کە شازادەی بچکۆلانە
وەسیەتی باوکی خوێندەوە ••

ناردی بەشوێن
حەکیمو دەمڕاستی کۆشکا
پێی‌وت : باوکی
چ کارێکی سەختو ستەم
لەمی منداڵ داوا ئەکا .

**حەکیم :**

ئەی شازادەی بچکۆلانە
چی ئەفەرمووی ؟

**شازادە :**

وەستێکە هێنانەدیی
زۆر گرانە ..
من نامەوێ بێمە سەرتەخت
بمە پاشا !

**حەکیم :**

بەڵام ئەی شازادەی نەوجوان
لە کۆنەوە .. یاسای نووسراو
یاسای وڵات
وای داناوە ..
شازادە کوڕ بێ .. یاخود کچ
ئەبێ تاجی پاشایەتی ..
لەسەر بنێت

**شازادە :**

بەڵام .. بەڵام
من نامەوێ بمە پاشا !

**حەکیم :**

کچە پاشایتو .. تاجیش هەر ،

هینی خۆته •• بینێته سەر •
ئەی شازادە ••
ئەم وڵاتە •• دێرزەمانە
بەختیارەو کامەرانە ••
چونکە یەك بەیەکی ئێمە ••
بۆ کاری خۆی
تێ کۆشیوەو •• ڕاپەڕیوە ••
ئەی شازادە •• پاشای باوکت
دنیای دیوە •• دانا بووە
لەخۆڕایی نەیوتووە ••
یان ئەبێ خۆر دابگریت‌و ،
بیهێنیتە ناو کۆشکەوە ••
یاخود ئەبێ هەتا ماوی
ژیانی خـــۆت ••
لەناو سنووقێکی تەختەی ،
داخراودا ، بەسەربەری !

**شـــازادە :**

کەواتە هەوڵ ئەدەم بچمە
سەر لووتکەی ئەو کێوە بەرزەی ؛
هەموو ڕۆژێ
خۆر بە لایدا دێت‌و ئەچێ
تـــۆ ئەڵێی چی ؟!

**حـەکیـــم :**

ئەی شازادەی پچکۆلانە
پێویستە هەر خـــۆت بەتەنیا

خــــۆر دابگری
بە بێیارمەتیی هیچ کەسێ !

ـ تاریکی ـ

**حیکایەتخوان :**

ئا بەوجۆرە کچی پاشا
بە شاخی بەرزا هەڵگەڕا
کاتێ گەیشتە سەر لووتکە
بینی هێشتا خۆر زۆر دوورە
زانی هیچ‌کەسێ ناتوانێ
خۆر دابگرێ
بەوجۆرە ‥ ڕۆی
کە هاتەوە کۆشك‌و تەلار
پەست‌و دڵتەنگ
چوەوە ناو ژوورەکەی خۆی

**شــــازادە :**

چی‌بکەم ؟! ‥ چی‌بکەم ؟!
من ناتوانم
خــــۆر لێرانە ئامادەکەم !

**حیکایەتخوان :**

ئیتر هەتاکو چەند ڕۆژێ
کچی پاشا ‥
لە ژوورەکەی خۆیدا تەنیا
درشت ‥ درشت
فرمێسکی چاوی هەڵئەڕشت
بەیانی‌یەك ‥ شازادەی مات

تەماشای کرد
پارچە کاغەزێکی بچووك
لەژێر دەرگای ژوورەکەیدا
دانراوە ..
ئەوسا ڕایکردو هەڵیگرت

**شـــازادە** « کاغەزەکە ئەخوێنێتەوە » :
لەناو ژووری داخراودا
خۆر سەر لە هیچ کەسێ نادا
هەرگیز .. هەرگیز ..
قەت ناتوانی
لەناو ژووری داخراودا
خۆر هەڵێنی .
« دوای ئەوە کاغەزەکە ئەخاتە لاوە »
سەرم سوڕماوە ..
تێناگەم
ئـەم کاغەزە سەیرە چی‌یە ..
با پاسەوانەکان بانگ کەم
ئەی پاسەوان ..
ئەی پاسەوان ..

**پاســــەوان :**
بەڵێ .. بەڵێ .. شازادەی جوان
ئەفەرمووی چێ ؟!

**شـــازادە** «دوای ئەوەی نووسینەکەی تەواو دەکات » :
هەر دەستبەجێ
ئەم نووسراوە ..

ڕاگەیێنن بە گشت کەسێ

**پاســـــەوان :**

بەڵێ •• بەڵێ

هەر ئیستەکێ •

**جــاڕچـــی** « لەبازاڕدا » :

ئەی خەڵکینە

گوێ ڕابگرن

یەك یەکتری ڕابسپێرن

فەرمانی کچی پاشایە ••

هەرکەس بتوانێ یارمەتیی

شازادەی خۆشەویست بدا ••

خۆر دابگرێو بیهێنێتە ناو کۆشکەوە ••

لە پاداشتا ••

دۆڕو مرواری وەرئەگرێ

**پیاوێکی ڕێبوار (١) :**

بانگەوازێکی زۆر سەیرە !

**پیاوێکیتر (٢) :**

کێ ئەتوانێ خۆر دابگرێو ،

خـۆر هەڵگرێ ؟!

**پیاوێکیتر (٣) :**

ئێمە برسێتیو نەبوونی

هێزی ئەژنۆی لێ بڕیوین

ئینجا سەربار ••

خـۆر دابگرین ؟!

**پیـــاو (١) :**

ئەوا دیسان
هەر بە ناوی شازادەوە
کەوتنە هۆنینەوەی پیلان !

**پیـــاو (٢) :**

ئەم کاسانە
هەزار ژێر کاسەیان هەیە !

**پیـــاو (٣) :**

کوێرەوەری •• نەبڕایەوە ؟!
دەردەسەری •• نەبڕایەوە ؟!

**ژنێکی ڕێبوار (١) :**

لەوە ئەچێ
کچی پاشا
شێت بووبێت •• شێت
ئەگینا چۆن
مەحاڵیوا داوا ئەکا ؟!

**ژنێکی ڕێبواریتر (٢) :**

من لەگەڵ قسەی تۆدا نیم
پێموایە شازادە ئێجگار
داناو زرنگو هوشیارە
چونکە عەوداڵی گەیشتن
بە مەحاڵە !

**پیـــاوێك :**

بەسە •• بەسە
توخوا ئەگەر نەیبڕنەوە ••

ئێمە چیمان داوە لەمە ..
گەر توانی‌یان خۆر دابگرن
ئەوا من خـۆم یەکەم کەسم
پشتیان ئەگرم !

**پیاوێکی‌تر :**

ئەی باشە گەر نەیان‌توانی ؟!

**پیاوەکەی پێشوو :**

ئەوسا هەڵوێستی لەبارتر
هەڵئەبژێرم !

- تاریکی -

**حیکایەت‌خوان :**

لەدوای ئەوەی کەس نەیتوانی
یارمەتیی شازادە بدا ..
ڕۆژی دوایی
حەکیمی کۆشك
چوەوە لای .. کچی پاشا .

**حـەکـــیم :**

ئەی شازادە ..
ئەو مۆڵەتەی پێت درابوو
وا خەریکە کۆتایی بێ !

**شـــازادە :**

لەبەرئەوەی
داخوازیی باوکم شتێکە ،
بەجێ‌هێنانی گرانە
داوا ئەکەم .. مۆڵەتەکەم
درێژتر بێ !

**خەکیم :**

ئەی شازادەی بچکۆلانە
پاشا بەرلەوەی ئەمری خوا بەجێبێنێ ••
پێی وتم هەر دوای مردنی
پێش شتنی
پێویستە مۆمێکی گەورە داگیرسێنم
جا ئەگەر مۆم توایەوەو •• تۆ
هێشتا وەسیەتەکەی باوکت
نەگەیاندبوە مەرامو جێ
ئەوسا ئەبێ کچی پاشا
ئامادە بێ بۆ ئەنجامی
پڕ لە سزا !

**شازادە :**

هەرگیز •• هەرگیز
من ناتوانم ئا بەمجۆرە
بمە پاشا
هەرگیز •• هەرگیز

– تاریکی –

**حیکایەتخوان :**

لە کاتێکدا کە شازادە
نوقمی خەمو پەژارە بوو
لەدەرەوە ••
لە بەردەرگا
پیرەمێردێ •• هەوڵی ئەدا
ملی ئەنا •• بچێتە ناو

ژووری کۆشك‌و تەلارەوە ..
بەڵام گاردی بەردەم دەرگا
دەریان ئەکرد
نەیان‌ئەهێشت ..
پیرەمێردیش .. کابرایەك بوو
گەلێ جیڕ بوو
لەسەر چوونە ژوورەوی ناو تەلار .. ئیجگار
ئێجگار سوور بوو !

**پیرەمێرد** « لە بەردەمی دەرگای کۆشکدا » :
تکا ئەکەم
ڕێگەم بدەن .. بچمە ژوورێ
من ئەمەوێ
یارمەتیی شازادە بدەم !

**پاسەوان** « بە گاڵتە پێکردنەوە » :
بڕۆ .. داماو
یارمەتیی چی ؟!
ئەی پیرەمێردی خەڵەفاو
چۆن بە ڕاستە
تۆ ئەتوانی
یارمەتیی شازادە بدەی
وەی .. وەی .. وەی .. وەی ؟!!
تەواومان‌کرد ..
خۆرمان داگرت !!

**پیرەمێرد** :
باشە ... بەڵام

به شازادەی ڕاگەیێنن
لەکاتێکدا پیرەمێردێ
ڕێگەی نەدرێ بـــۆ ژوورەوە
ئەی چۆن چاوی
بڕیوەتە ئەوەی ڕۆژێ
خـــۆر بباتە ناو کۆشکەوە ؟!

– تاریکی –

**حیکایەتخوان :**

لەم سانەدا ••
پیرەمێردی •• پشت کۆماوە
بەر دەرگای کۆشکی بەجێهێشت
کچە پاشا ••
ویستی هاواری لێ بکا ••
بەڵام پیرە
لە کۆڵانی ئەو ناوەدا
لە چاو ونبوو

**شـــــازادە :**

ئەی پاسەوان
هۆ پاسەوان
کوێوە ڕۆی ئەو پیرەمێردە ••
لە سەر عەرد بێو لە بن عەرد بێ
داوا ئەکەم •• بیدۆزنەوە ••
تا بیدوێنم !

– تاریکی –

**حیکایەتخوان :**

لەدوای ئەوەی پاسەوانان

ئێجگار گەڕان ..
شەقام .. شەقام
کۆڵان .. کۆڵان
بەڵام پیرەمێردیان نەدی ،
گەڕانەوە ..
چۆن ڕۆشتبوون واش‌هاتنەوە !

**شـــــازادە** « سەرکردەی پاسەوانان لە بەردەمیا وەستاوە » :
دەربارەی ئەو پیرەمێردەی
کە دەرتان‌کرد
پرسێك ئەکەم ؟!

**ســـەرکردەی پاسەوانەکان :**
فەرموو چێت ئەوێ بپرسە ؟!

**شـــــازادە :**
ئایا ئەمە یەکەم جارە
کە پیرەمێرد ..
ڕوو بکاتە ئەم تەلارە ؟!

**ســـەرکردە :**
هەموو ئێوارانێ هەر دێ
بەڵام گاردی بەردەم تەلار
ڕێی لێ ئەگرێ
چونکە ئەڵێن ..
کابرا شێت‌و خەڵەفاوە !

**شـــــازادە :**
شێوەو ڕەنگی
کابرا چۆنە ؟!

**ســـەرکردە :**

پیاوێکی ڕووت و هەژارە

زۆر پیر بووە ••

بەردەوامیش •• چراوگێکی

لەگەڵ خۆیدا •• هەڵگرتووە !

**شـــازادە :**

ئەگەر سبەینێ ئێوارێ

ئەو پیرەمێردە هاتەوە ••

ڕێی بدەن با بێتە ژوورێ

**ســـەرکردە :**

بەڵێ •• باشە !

– تاریکی –

**حیکایەتخوان :**

ڕۆژی دوایی

مامە پیرە •• نەهاتەوە ••

شازادە خەم دایگرتەوە ••

کاتێ لە ژوورەکەی خۆیدا ••

نائومێد بووبوو •• ئەگریا ••

نامەیەکی‌تری بینی ••

فڕێ درابوە بن دەرگا

ئەوسا ڕای‌کرد

نامەی هەڵگرت

**شـــــازدە** « نامەکە ئەخوێنێتەوە » :

« دەرفەت کەمە

مۆمی گەورە وا خەریکە بتوێتەوە

گڕێ کوێرەی گیروگرفت

بەم گریانو دۆش‌دامانە
ناکرێتەوە »
چی بکەم ؟! چی‌بکەم ؟!
تۆ بڵێی لەم ناوچەوانە
وا نووسرابێ
ژیان لەناو سنووقێکی داخراودا •• بەسەربەرم ؟!
خوایە چێ بکەم ؟!
خوایە چارێ ؟!

**شـــــازادە** « ڕووئەکاتە سەرکردەی پاسەوانەکان » :

پاسێرە ••
من ئەمەوێ لە ئێستەوە
لە سەرانسەری وڵاتدا ••
ورد بگەڕێن
هەرچی پیاوێکتان بەدی‌کرد
چراوگی وا •• بەدەستەوە
ڕەوانەی کەن •• بێتە ئێرە !

**ســـەرکردە :**

ئەمە هەمووی
تەنیا لەبەر
پیرە مێردێکی خەڵەفاو ؟!

**شـــــازادە :**

من •• پێویستە
ئەو پیرەمێردە ببینم
کێ ئەڵێ چار

لای ئەو نی‌یە !؟

ــ تاریکی ــ

**حیکایەتخوان :**

لەسەر فەرمانی شازادە
بۆ سبەینێ بەیانی زوو
تاریك‌و ڕوون ••
سەرکردەی گشت پاسەوانان
پاسەوانی دانا لەسەر :
سەری جادەو •• پێچی کۆڵان
ئەمری دانێ :
چاوەڕوان کەن •• هەتاوەکوو تاریك دادێ
ئەوسا هەرچی
پیاوێکتان دی
چراوگێکی بچکۆلانەی هەڵگرتووە
بیگرن ، دەم‌ودەست‌و خێرا
بینێرن بــۆ کۆشکی پاشا
بــۆ •• ئێوارە
شازادە هەستاو ڕووی‌کردە
بەر پەنجەرە ••
غەمبار •• دانیشت
تەماشای ڕێگەو مەیدانی
بەردەم کۆشکی گەورەی ئەکرد
چاوەڕوان بوو
بگەنە لای
ڕیزە پیاوی چرا بەدەست !

لەپڕێکدا •• کچە پاشا
سەرنجی دا ••
دیمەنێکی سەیری بینی‌و :
سەری سوڕما
**سەرکردەی پاسەوانەکان** « لە بەردەمی دەرگای کۆشکەوە » :
بیکەنەوە ••
هەرچی دەرگای ئەم کۆشکەیە
بیکەنەوە ••
**حیکایەتخوان :**
هێندەی نەبرد
لە گشت لاوە
چرا بەدەست لە بەردەرگای
کۆشکی پاشای •• خڕ داخراو
گردبوونەوە ••
ڕیز •• ڕیز •• بە پاڵی یەکەوە
هەتا ئەهات •• چرا هەڵگر
زۆرتر ئەبوون
بە بێ‌ئەوەی دەرفەتیان بێ‌و ،
پێ بنێنە ناو کۆشکەوە •
**سەرکردەی پاسەوانان** « لە بەردەمی شازادەدا » :
ئەی شازادە ••
دەرگاکانی کۆشك‌و تەلار دەنگن ، بەرگەی
چوونە ژوورەوی ئەم خەڵکە
زۆرە ناگرن
چی ئەفەرموون ؟!

**شـــــازاده :**

بیڕووخێنن ••
هەرچی شوورەی بەرزی کۆشکە
بیڕووخێنن ••
هەتاکوو بێنە ژوورەوە ••

– تاریکی –

**حیکایەتخوان :**

لەسەر فەرمانی شازادە
هەر ئەو شەوە
چی سەربازو پاسەوان بوون
کەوتنە ڕووخاندنی شوورە
بۆ بەربەیان
تەخت کران
ئەوسا کچە پاشای سەلار
لە ژوورەکەی هاتە دەرێو ،
ڕوویکردە ناو ،
باخچەی جوانی کۆشكو تەلار !

**شـــــازادە « لەگەڵ سەرکردەی پاسەوانەکاندا » :**

سەرنجتدا ؟!
ئەو پیرەمێردەت ناسیوە ،
لەناویاندا ؟!

**سـەرکردە :**

ئەی شازادە ••
چۆن بتوانم بیناسمەوە ••
لەکاتێکدا ••

دەمچاوی هەر هەموویان
وەکوو یەکە !
**شـــــازادە :**
هەتا ئیستە
نەمئەزانی
لەناو ئەم ولاتەی مندا ..
ئا ئەمەندە ..
زۆرە چرا !
**ســەرکردە :**
وا دیارە لە دز ئەترسن ؟!
**شـــــازادە :**
نەء .. نەء
کاتێ کە تاریکی دادێ
هەموو پیاوێ
چراوگەکەی خۆی هەڵئەگرێو ،
بە ڕووناکی ..
ڕێگە ئەبڕێ !
**حـەکــــیم :**
ئەی شازادە
تۆ ئەتوانی
هەر بە یەك جار
ئەم چرایانە هەلگری ؟!
**شـــــازادە :**
بێگومان .. نەء !
**حـەکــــیم :**
هەروەهاش خــۆر

زۆر گەورەترە لەوەی کە پیاوێ
یاخود ژنێ ••
بە تەنیا خۆی هەڵیبگرێ !

**شـــــازادە :**

ئا •• ئیستەکە لە مەبەستی
باوکم بە چاکی گەیشتم
ئەم چراوگە پچووکانە
هەر هەموویان کە پێکەوە
گردبوونەوە ••
ئەبن بە خۆرو ئەوساکە
دێنە ناو ژووری کۆشکەوە !

**حـەکـــیم :**

بەڵێ •• وایە
بەڵام شازادە بڕوانە ••
تەماشا کە !
سەرنج بدە •• چۆن لە نێوان
پەنجەرەوە ••
بەرەو ناخی کۆشكو تەلار
خۆر مل ئەنێ
بۆ ژوورەوە !

**شـــــازادە :**

ئێجگار سەیرە ••
یەکەم جارە
ئەمە ڕوودات !

حەكیم :

بەڵێ شازادەی میهرەبان
یەكەم جارە ئەمە ڕوودات
چونكە تۆ شوورەو دیواری
كۆشكت ڕووخان
ئەی نازانی ؟!
ئا ئەو شوورەو دیوارانە
بووبوونە هۆی
ئەوەی بە زۆر
ڕێی هاتنە ژوورەوە بگرن
لە تیشكی خۆر

« وچان »

ئەوا ئیتر لەئیستەوە
بووی بە پاشا
چونكە وەسیەتەكەی باوكت
بەجێ‌هێناو ،
توانیشت خۆر
بهێنیتە ناو كۆشكەوە !

# پێداچوونەوەی هەندێ بیرو ڕا
# لە دەوروبەری ڕێنووسی کوردی و یەکخستنیدا

حول

**موحەممەدی مەلا کەریم**

دۆستی خۆشەویستم کاک جەلال دەبباغ ، دوابەدوای وتارەکەی من لە هاوکاریی ژمارە ٤٢٥ی ڕۆژی ١٩٧٨/٥/٨و وتارەکەی کاک حوسێن عارف لە هاوکاریی ژمارە ٤٢٦ی ڕۆژی ١٩٧٨/٥/١٥دا لەمەڕ یەکخستنی ڕێنووسی کوردی‌یەوە ، وتارێکی لە ژمارە ٢٩٣ی ڕۆژی ١٩٧٨/٥/٢٧ی بیری نوێدا بڵاو کردەوە • ئەویش لەو بابەتانە کۆڵیبووەوە کە منو کاک حوسێن لێ‌یان دوابووین • بەڵام لە دووتوێی وتارەکەیدا ڕەخنەی لە چەند پارچەیەکی وتارەکەی من گرتبوو و بیری تایبەتیی خۆی بەرانبەر بەو بیرانەی من دەربڕیبوو • بۆیە منیش پێم‌خۆشە بە چەند لاپەڕەیەك لەو بیرانەی کاك جەلال بکۆڵمەوەو بەپێی تێگەیشتنی خۆم ڕووی ڕاستی قسەکانی خۆمو بۆنەچوونی کاك جەلال لە هەندێ لە بیرەکانیدا بخەمە ڕوو[1] •

کاك جەلال ڕەخنەی لەوە گرتبوو کەوا من بیرنەکردنەوەی زووی کوردم لە داڕشتنی شێوەیەکی تایبەتی بۆ دەنگی کوردی گێڕاوەتەوە بۆ موسوڵمانەتیمان [ کە ئایینی ئیسلام لە سەرەتای هاتنیەوە بۆ کوردستان ، تیپی عەرەبیی کردووە

---

(١) هەرچەند ماوەیەکی کەمیش نا بەسەر بڵاوکردنەوەی ئەو سێ وتارەدا تێپەڕیوە کە ئەم وتارەیان دوابەدوا نووسراوە ، هێشتا لەبەر بایەخی بابەتەکە ـ بە بۆچوونی خۆم ـ بە پێویستم زانی ئەم وتارەم بڵاو بکەمەوە کە وەختی خۆی دەرگای هەردوو ڕۆژنامەی (هاوکاری)و (بیری نوێ)و گۆڤاری (بەیان)و ( ڕۆژی کوردستان )ی لە ڕوودا داخرا •

به تیپی پێنووسینمان ، خوا به زمانی عەرەبی نووسیبێتمان یا به فارسی یا بــه کوردی ]و بۆ ، پێوەندی دێرینو لەمێژمان لەگەڵ کولتووری عەرەبو فارسو ، نووسیبووی هۆی ئەم بیرنەکردنەوەیە ئەوە نی‌یە کە من نووسیومە ، بەڵکـــو « هۆی سەرەکیی ئەو ڕاستی‌یەو گەلێ گیروگرفتی‌تری زمانو نووسین ئەوەیە کە کورد قەوارەیەکی سیاسیی خۆی نەبوە » •

من ئەمەم بەلاوە هەڵەیەو قسەکەی خۆمم بەلاوە ڕاستە ، چونکە کاتێ کە ئایینی ئیسلام هات ، هەستی نەتەوەیی نە لەناو عەرەبو نە لەناو کوردو نە لەناو هیچ گەلێکی‌تردا پەیدا نەبووبوو تا ناکۆکی‌یـــەکی نەتەوەیی لەنێوان عەرەبو گەلانی ئەو وڵاتانەدا پەیدا بێ کـە ئیسلام داگیری کردن • ئیسلامەتی خۆی وەك ئایینێکی « ئوممی » هاتە ئاراوە کە داوای ئوممی‌یەتێکی ئیسلامی ئەکات « وان هـــذە امتـــکم امـــة واحـــدة ، وانـــا ربکـــم فاعبـــدون » ، « انما المؤمنون اخوة » • مەبەســـتم لە ئوممی‌یەتی ئیســـلام ئەوەیـە چۆن جووڵانەوەی چینایەتی جیاوازی لەنێوان ئەندامانی چینەکـــەدا ناخا بەگوێرەی نەتەوەیان ، ئیسلامەتیش هەروا جیاوازی لەنێوان موسوڵمانانا ناخا بـەگوێرەی نەتەوەیان • ڕاستەکەی ئیسلام بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بوو نەك نەتەوەیی • هەر بۆیەش وا زوو بەئاسانی توانی ئەو هەموو وڵاتەی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژاوا داگیر بکات • پاشانیش کە کێشە لە هەموولایەکەوە سەری هەڵدا ، مەسەلەکە هـــەر نەتەوەیی نەبوو ، مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتی‌و چینایەتی بوو هەرچەند لە هەندێ شوێنیش شێوەی نەتەوەیی پێوە دیاری دابێ • ئەمە لای هەموو ئەوانەی کـە مێژووی خەباتی کۆمەڵایەتیی ســەردەمی عوسمانی کوڕی عـــەففان بەدواوە ئەزانن‌و هوشیاریی چینایەتی‌یان هەیە ، بەتەواوی ئاشکرایە • لەبەرئەوەش کە ئیسلام لە عەرەبستاندا پەیدابوو ، دیارە ئەبوو قورئان عەرەبی بێ‌و کولتوور بە زمـــانی عـــەرەبی بێ‌و ، چونکـــە ئیســـلامیش تەنهـــا پێوەنـــدی نێوان خواو بەنـدەی ڕێكنەئـــەخست ، بەڵکو دەســـتی بەســـەر تێکڕای

ژیانی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و کولتووریدا گرتبوو ، ئەبوو عەرەبی ببێ بە زمانی هەموو ئەم بابەتانە • لەمە بەولاوە چارەیەکی‌تر نەبوو • تەنانەت بەش‌بەحاڵی گەلێکی خاوەن مێژووی سیاسی‌و کولتووریی وەك گەلی فارسیش کە زووبەزوو کەوتەوە دروست کردنی زمانێکی ئەدەبیی نوێ بۆ خۆی ، زمانی عەرەبی سەدان ساڵ وەك زمانی کولتوورو سیاسەت‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری مایەوە • ئەبوو هەر واش بێ • عەرەبیی ئەو سەردەمە دەورێکی وەك ئەو دەورەی بینی کە ئێستا ڕووسی لە ژیانی گەلانی سۆڤیەتدا ئەبینێ کە دیارە ئەوەی تۆزێ مەوزووعی‌یەتی ببێ دان بەوەدا ئەنێ کە بڵاویی زمانی ڕووسی لە سەرانسەری ولاتی سۆڤیەتدا هیچ نیشانەیەکی داگیرکردن‌و زۆرەملێ‌و چەوساندنەوەی کولتووریی پێوە نی‌یە •

لە سەرێکی‌تریشەوە کورد خۆی لە پلەیەکی ئەوەندە بەرزی شارستانەتیدا نەبوو بەتەنگ زمانی ئەدەبی‌و ئەدەبی نەتەوەیی‌و شتی‌واوە بێ • کورد گەلێ گەلێ لە فارس لەپاشتر بوو • لە قۆناغی سەرەتای دەرەبەگیدا بوو ، خێڵەکی بوو ، بە هیچ کلۆجێ وەك گەلێك ، لەو پلەیەدا نەبوو بیر لە کولتوورو زمانی ئەدەبی‌و نووسینی نەتەوەیی‌و شتی‌وا بکاتەوە ، نەخوازەلا لەکاتێکدا کە ئایین‌و فەرمانڕەوایش لێك‌ئالابوون‌و هەردوکیشیان لە کولتووری عەرەبیدا یەکیان گرتبووەوەو مرۆڤ خۆی بیری لەوە نەئەکردەوە پەل بۆ دەرەوە بهاوێژێ •• سەرتان لەم قسانە سوور نەمێنێ ، تەنانەت بیر لەوە بکەنەوە کە شیعری کوردی [ شیعر کۆنترین چەشنی ئەدەبە ] لە پتر لە ٥٠٠ ساڵ پاش هاتنی ئایینی ئیسلامەوە بۆ کوردستان دەست پێ‌ئەکا • ئەمەیە هۆی پەیدا نەبوونی ئەلف‌و بێی تایبەتیی کوردی نەك نەبوونی قەوارەی سیاسی •

ئەمجا ئەگەر مەسەلە بوونی قەوارەی سیاسی‌یە ، کێ ئەڵێ کورد قەوارەی سیاسیی نەبوە ؟ لەوڕۆژەوە کە چەرخی زێڕینی دەوڵەتی عەبباسی بەسەرچووە ، کوردستان بێ‌بەش نەبوە لە گەلێ میرنشینیی بەڕاستی سەربەخۆو ئەم حاڵەتە تا

پاش شەڕی (چاڵدیران)ی نێوان عوسمانی‌یەکان‌و سەفەوی‌یەکان بەردەوام بووە هەرچەندیش گەلێ‌جار هەندێ بەنی کوردستان کەوتووەتە ژێردەستی بووەیهی‌و سەلجووقی‌و مەغوول‌و تەتەرو دەوڵەتانی‌تر •

خۆ ئەگەر بەمەش باوەڕ نەکەین ، ئەی ئەبێ بۆ ئێران بڵێین چی ؟ ئێرانی‌یەکان هەر لە سەردەمی سامانی‌یەکانەوە لەژێر ڕکێفی عەبباسی دەرچوون‌و قەوارەی سیاسیی خۆیانیان پێکەوە نایەوەو تەنانەت خەلیفەی بەغدایشیان چەند جارێك خستە ناو قەفەزی خۆیانەوە • کەواتە ئەی ئەوان بۆ پیتی تایبەتی‌یان بۆ دەنگەکانی خۆیان دروست نەکرد ، یا نووسینە کۆنەکەی خۆیانیان زیندوو نەکردەوە ؟ ئەی تورکە عوسمانی‌یەکان کە زوربەی وڵاتانی ئیسلام‌و تا ناوەڕاستی ئەورووپایان داگیرکرد •• ئەوان بۆچی بیریان لەوە نەکردەوە لە چوارچێوەی تەسکی تیپی عەرەبی دەرچن ؟ •

کەواتە مەسەلە مەسەلەی بوون‌و نەبوونی قەوارەی سیاسی نی‌یە • مەسەلەی پێ‌نەگەیشتنی شارستانەتی‌و هەست‌نەکردنە بە گیانی نەتەوەیی • ئەگەر ئەوە هەبوایە ، با قەوارەی سیاسی‌یش نەبوایە ، بیر لە دروست‌کردنی ئەلف‌و بێی تایبەتی‌و زمانی ئەدەبی‌و شتی‌وا ئەکرایەوە • نابینی بولگاریایی‌یەکان کە ژێردەستەی تورکیش بوون‌و دەوڵەتیان نەبوو ، چۆن ئەلف‌و بێی تایبەتیی خۆیانیان دامەزراندو کولتووری میللیی خۆیانیان پێکەوەنا • هەروەها گەلێ گەلی‌تریش لە ناوەڕاستی ئەورووپادا • ئەوەش کە تورکەکان لەپاش شەڕی یەکەمی جیهان دەستیان‌دایەو تیپی عەرەبی‌یان گۆڕی بە تیپی لاتینی ، بەرپەرچی قسەکەی من ناداتەوە ، چونکە ئەو کارەی ئەوان ئەنجامی ئەو گۆڕانە تەبیعی‌یە نەبوو کە من بەش‌بەحاڵی ڕەوتی ئاسایی مێژوو باسی لێ ئەکەم ، بەڵکو کارێکی ناسروشتی‌و دەستکردو زۆرەملێ بوو بەسەر گەلانی تورکیادا سەپێنراو لە پێویستیی ژیانی کولتووری‌و لە ناخی گەل‌و پێویستی‌یەکانیەوە هەڵنەقوڵابوو •

کاك جەلال لای‌وایە « نووسینی کوردی بە پیتی لاتینی ، چاکترین

ڕێگەیە بۆ دواڕۆژ هەرکاتێــك گــەل توانی بڕیاری بدات ، ئەوا ئاسانترەو لە بنەڕەتەوە ڕێنووسی زمانەکەی پێ یــەك دەخرێتو بەخێرایی بەرەو پێشتر دەچێت » •

دیارە ئەم مەسەلەیە بە بڕیاری ئەمو ئەو نابڕێتــەوەو وەك کاك جەلال ئەڵێ « گەل هەروەختێ توانی » چاکــەو خراپەی ئــەم ڕێگایە لێك‌بداتەوە ، بڕیاری خۆی لەسەر ئەدا • بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من هەر بە پێویستی ئەزانم بڵێم وەختی ئەوە هاتووە هەستی نەتەوەیمان لــە چوارچێوەی کەف‌وکــوڵ دەرچێو پشت بە زانستو لێکۆڵینەوەی وردو هەڵسەنگاندنی هوشیارانە بڕیاری تیا بدرێ • ئێمە سەردەمێکمان بەسەردا تێپەڕی ئەوەی داوای بە لاتینی نووسینی کوردیی نەکردایە لەلایەن زۆرکەسەوە بە زۆڵە کوردو کۆزمۆپۆلیتو شتی‌وا دائەنرا ، وەك بڵێی گەلی کورد یەکێك بێ لە گەلە لاتینی‌یەکان • ئەو هــەموو گۆڕانە سیاسی‌یانەی بەسەر وڵاتەکەماندا هاتــــن ، کارێکی ئەوتۆیان کــرد زۆرکەس چاو بە هەڵوێستی خۆیدا بگێڕێتەوەو ڕەخنەیــەك لە خۆی بگرێ • ئێستاش کە کاك جەلال ئەم پێشنیارە دێنێتەوە ئاراوە ، من بە دڵ حەز ئەکــەم بێ سڵ‌کردنەوە لە هیچ جۆرە حەساسی‌یەتێك ، بەکاوەخۆ لێی بکۆڵرێتــەوەو ئەم‌دیوو ئەودیوو سەروبن بکرێو چاکەو خراپەی دەربخــرێ ، بۆئەوەی بڕیاری سبەینێمان بڕیارێکی زانستانەو دوور لە هەموو جۆرە هەڵچوونێــك بێ • بۆیە من خۆم باوەڕی خۆم دەرئەبڕم کەوا هەرچەند لەوانەیە نووسینی لاتینی هەندێ گیروگرفتی ئێستای ڕێنووسمان بۆ چار بکا ، بەڵام کۆمەڵێــك گیروگرفتی نوێ‌یشمان لە ڕوودا ئەکاتەوەو ، ئەویش بە بێ‌دەسکاری‌یەکــی زۆر بەدەنگی دەنگە کوردی‌یەکانەوە نایەت • سەرەڕای ئەوە پێوەندمان بــە کەلەپووری کۆنی خۆمانو گــەلانی عەرەبو فارسەوە ئەبڕێت کــە ناتوانین نەڵێین بەشێکی گــەورەی بناخەی کولتوورمانی لێ پێك‌دێت • بۆنموونە گەلە موسوڵمانەکانی سۆڤیەت کە لەبەر پێوەندیان بە یەکێتیی سۆڤیەتــەوە وەك

دەوڵەتێك کە زمانی ڕووسی زمانی سەرەکی‌یە تیایداو ، بەهیوای ئەو پاشەڕۆژە گەش‌و ڕووناکەوە کە لەم ڕێگایەوە چاوەڕوانی‌یان دەکات‌و هەر لە ئێستاشەوە نیشانەی بەئاشکرا دەرکەوتووە ، بە پێویستیان زانی دەست لە ئەلف‌و بێی عەرەبی هەڵگرن‌و ئەلف‌و بێی ڕووسی ـ بە وردە دەسکاری‌یەکەوە ـ وەربگرن‌و بیکەن بە ئەلف‌و بێی زمانە نەتەوەیی‌یەکانی خۆیان • ڕادەی پێشکەوتوویی تێکڕای یەکێتیی سۆڤیەتیش گەلێ کون‌و کەلەبەری ژیانی کولتووری‌یانی بۆ پڕکردنەوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەبیرچوونەوەی تیپی عەرەبی‌و فارسی زیانێکی زۆری بە پێوەندی کولتووری‌یان بە ڕابوردووی خۆیان‌و گەلە موسوڵمانەکانی دراوسێ‌یانەوە گەیاندووە • ئەمە ڕاستی‌یەکە ناکرێ هەرگیز لە بیری بکەین • کەواتە ئەی ئەبێ ئێمە لەپێناوی چیدا ئەم پێوەندی‌یەمان ببڕین‌و چاوەڕوانی چ خێروبێرێکی تایبەتی بین لە بەکارهێنانی تیپی لاتینی‌یەوە بەسەرماندا بباریێ !

کاك جەلال ڕەخنەی لەوەشم گرتبوو کە من لاموایە لەوانەیە هەستی نەتەوەیی‌و نیشتمان پەروەریی مامۆستایانی کورد تەگەرەکانی ڕێگای یەکخستنی ڕێنووسی کوردیمان ـ لە ڕێگای دەرز وتنەوەوە بە قوتابی‌یان ـ بۆ تەخت بکا • من بۆیە لاموایە ئەم قسەیەم ڕاستە ، چونکە لە مێژوودا گەلێ کاتی‌وا ڕێ‌ئەکەوێ گەلی هوشیارو کەسانی دڵسۆز بەرابەر بەو گیروگرفتانەی لەڕێ‌یاندان‌و بۆ بەرگری لە خۆیان توانایان چەند قات ئەبێتەوەو کاری‌وا ئەکەن لە باری ئاسایدا بە کەس نەکرێ •• تۆ هەر سەیرێکی مێژووی خەڵکی ڕەش‌وڕووتی ڕووسیای پاش شۆڕش‌و ساڵانی بیست‌و سی بکە •• بڕوانەرە ڕووداوەکانی سەردەمی جەنگی دووهەم لە یەکێتیی سۆڤیەتدا •• بەزەحمەت بنیادەم ئەتوانێ باوەڕ بکا گەلێکی‌وا برسی‌و ماڵوێران‌و وڵات داگیرکراو ، ئەگەر تامی ژیانی نوێ‌و پێویستیی پاراستنی خۆی‌و ئەو ژیانەی‌و بەرگری لە دوارۆژی بەرابەر بە گەردەلوولی کۆنەپەرستی‌و فاشیزم نەبوایە ، ئەیتوانی

خۆی ڕابگرێو سەرەڕای ئەوەش ولاتەکەی بگەیەنێتە ئەو پلەیە کە ئێستا بووە بە یەکێك لە دوو ولاتی هەرە بەدەسەلاتی جیهان • کەواتە منیش زۆر لەجێی خۆیایەتی هەستی نەتەوەیی‌و نیشتمان پەروەریی مامۆستایانی کورد بزوێنم‌و بەهیوا بم لە ڕێگای دەرز وتنەوەوە بە قوتابی‌یان ئەو تەگەرە مێژوویی‌یە لە بەرپێی وەچەی داهاتوومان‌دا تەخت بکەن •

سەرەڕای هەموو ئەمە ، من ئەرکێکی ئەوەندە زلیشم نەخستووەتە ئەستۆی مامۆستایان‌و خەلك کە لە عۆدەی نەیەن • من داوام کردووە نوێنەرانی دەزگا کولتووری‌یەکانی کورد کۆببنەوەو بگەنە بڕیارێك لەبارەی ئەو چەند بابەتەوە کە ئێستا نووسەران لە جۆری نووسینیاندا هاودەنگ نین ، تا پاشان ڕۆژنامەنووسەکان لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیانداو ، دەزگای خوێندنی کوردی لە کتێبە کوردی‌یەکانی قوتابخانەکاندا بەگوێرەی ئەو بڕیارانە بنووسن • بێگومان بەشێکی زۆریش لە مامۆستایان کە دی‌یان کتێبەکانی قوتابخانەکان چۆن نووسراونەتەوە ، ئەوانیش قوتابی‌یان وا فێری نووسین ئەکەن‌و خەلکی تریش وردە وردە لە ڕێگای خوێندنەوەی گۆڤارو ڕۆژنامەوە بەوجۆرە ڕێنووسە ڕادێن‌و پاش چەند سالێك ئەم ڕێنووسە ، بەتایبەتی لە ڕێگای وەچەی نوێی قوتابخانەکانەوە ، زوربەی کوردەکە ئەگرێتەوەو ، هەر ئەمەشە چارەو ، چارەی مەسەلەی‌وا بە زۆر ناکرێ تا پێویستی بە دەولەت بێ •

دواجاریش دووبارەی ئەکەمەوە هەرچەند پڕ بە دل حەز ئەکەم ئەگەر تەنها ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیش ڕێنووسی یەکگرتوو بۆ خۆیان دانێن‌و ، ئەلێم هەر باشەو زۆریش باشە ، بەلام ئەمە نە ئەبێ لە جێی پێشنیارەکەی من بێ‌و نە پێشنیارەکەی منیش ڕێی لێ ئەگرێ •



**ئازاد دڵزار**

**١ ـ چـــاو :**

ئەستێرەیێکی گەش ڕژا
لە کازیوەی بەر بەیانا
چاوەکانی ئەو جوامێرەم کەوتەوە یاد ،
بەسەر تیژاییی نێزەدا هەڵخلیسکا ،
هەروەك ئەو هێلکە تفنیلەی ،
لە هێلانەدا دەکەوێ ،
بە شوێنێکی بەردەڵانا .

**٢٦ـ٥ـ٩٧٨**

**٢ ـ چراوگ :**

دەستە ڕێژێك ،
سەگ‌وەڕی دوور بەدوایەوە .
هەموو دەرگاکان داخران ،
دوا چراوگی شەو بێداران کوژایەوە .
هەتا سبەی یەکەم هەواڵ
ـ دەڵێ : لاوێك لە ناو کەڵەکێك برینا
لە دڵی دایکیا نێژرا .

**٢ـ١ـ٩٧٩**

### ٣ ـ سـوار

وا دیسان لە دەرگا دەدرێ
لە شارە غەمبارەکەما ،
سوارێکی ڕەش ،
توند دەمامکی خـۆی بەستوە[١]
کۆڵان بە کۆڵان دەگەڕێ •
ئەوەی بێ چەك
دەرگای لە ڕوو بکاتەوە ،
هەر وەك بەرخ سەری دەبرێ

١٩٧٦

### ٤ ـ نیشانە

کارە مەرەزێکی شینك
تخووبی پاوانی بەزان •
بۆیە پیاوی ئاغای ئەوبەر
ناو چەوانی کردە نیشان

١٩٧٥

### ٥ ـ ئەشکەوت :

لەو تاتوكو زەنوێرەدا ،
دوای کارە کێوی‌یێ کەوتم[٢]
لەپڕ خـۆی کوتا ئەشکەوتێ ،
کاتێ بێپارێز بەدوایا بە ژوور کەوتم

---

(١) بـۆ ئەم شیعرە سوود لە ئەفسانەی کۆنی کوردی وەگیراوە •

(٢) بـۆ ئەم شیعرەش سوود لە ئەفسانەو سەر بردەی کۆن وەرگیراوە •

بوو بە دێوێکی چنگ بە خوێن ،
خڕ دەرگای لەسەر داخستم .

١٩٧٦

٦ ـ تـــەرزە :

پێیان دەڵێم :
بچنە بەرایی برووسکە ،
تا گێشەو خەرمانەکانمان
ئاگر نەگرن ،
لێرەکانمان نەبنە سووتو ،
چیتر تەرزە ،
فەریکە سێوەکان نەکوتن

١٩٧٧

٧ ـ گوێـــز :

مناڵێك بـــۆ گوێز دەگریا ،
سموورەیێك ،
فرمێسکەکانی لستەوە ،
ـ گوتی : مەگری ،
هەزاران گوێزم ناشتووە
لەو خاکەدا .

٦ـ١ـ٩٧٩

٨ ـ شـــلێر :

کە مناڵێکی چایی بەندان دەڵێ
سێندار گەز گەز باڵا دەکا
تومەز شلێر ،
جگەر سووتانی زۆر دیوە ،

هۆن هۆن دەگری

لە ئەژمەتا •

۱۹۷۹-۱-۷

**۹ ـ سـمۆرە :**

کۆترێك لە لوبنانەوە هات ،

گێڕایەوە :

کە چۆن درەختی زەیتون‌و

دارستانی «ئەرز»یان سوتان ،

لەوکاتەدا سمۆرەیێك زریکانی ،

ـ فریا کەون ،

وا دار گوێزەکان داگیرسان •

**۱۰ ـ ڕووبـار :**

۹۷۹-۱-٦

ئەو ڕووبارەی وا برخەی دێ

لەژێر پەردەی ڕەشی شەوا ،

تۆ وا مەزانە خەوتووە •

ئەو کۆلکە مێوە کرمۆڵەی ئەو تەلانە ،

وا مەزانە وشك بووە

هێندەت زانی ،

سەهۆڵ بەندانی ئەو شاخە

کرایەوە

ڕووبار بە چاوی سوورەوە کەوتە سەر پێ ،

کۆلکە مێو توولەی هاویشت‌و

ڕشایەوە •

۹۷۸-۹-۲۸

# دەستنووسی „بەرصیصی عابید„
# لەبەرهەمی
# „فەقێی تەیران„

عبدالرقیب یوسف

فەقێی تەیران یەکێك لە شاعیرە کۆنەکانی کوردە کە بناغەی ئەدەبی کوردی‌یان داناوە • تەیران شاعیرێکی پایەرز بووەو بەرهەمێکی زۆری بەجێ هێلاوە • بەرهەمەکانی زۆر سادەو سازو ڕەوانن و نزیکی شێوەی قسەکردنی جەماوەری خەلکن • ئەتوانین بەرهەمەکانی فەقێی تەیران بکەین بە دوو جۆر : جۆری هەلبەستی بلاو بلاو یانێ (قەسیدە)و هی‌تر لە چەند چیرۆکی ئایینی‌و نەتەوایەتی پێك دێ کە بەشێوەی هەلبەست دارژاندنەو ئەو چیرۆکانەش هەریەکیان بە پەرتووکەکی سەربخۆ دژمێررێ • تەیران یەکەم کەس بووە چیرۆکی کوردیی نووسیوەو ئەتوانین بە یەکەم چیرۆكنووسی کوردی لە قەلەم بدەین •

هەلبەستەکانی تەیران بە بلاوی زۆرن ، بەلام چیرۆکەکانی کە بە شێوەی پەرتووك‌و کتێبن ئەوەی کە ئێمە پێی‌ئەزانین هەتا ئێستا ئەمانەن :

١ ــ شێخی صنعانی یان شێخی‌صنعانیان لە سالی ١٠٣٠ك = داینــاوە • ئەم چیروکەی (٧٢٠) دێرە شیعرە بەپێی یەکێك لەو سێ دانە دەستنووسەی کە لەلامانە •

٢ ــ هەسپێ ڕەش •

٣ ــ سیسەبان •

٤ ــ خانی دم‌دم •

٥ ـ برصیصێ عابید •

هندێك ئەڵێن چیرۆكی (ستیو فرخ)یش ئی فەقێی تەیرانە •

ئەو بەرهەمە كە لەم وتارەدا باسی لێ ئەكەین بەرهەمی پێنجەمە كـــە دەربارەی بە سەرهاتی بەرصیصی عابدە • ئەم بەرهەمەی تەیـــران زۆر نایابە چونكە ناوی تا ئێستا نەكەوتوەتـە بەرچاومان لەســەرچاوە مێژوویـیو ئەدەبی‌یەكانمانداو ناوی نەكەوتبوە بەرگوێچكەمان لە پێش دۆزینەوەی دانەیێكی دەستنووس لەم بەرهەمە لە دەرەوەی عیراق • وا دیارە دانەكانی زۆر كەمـە ، چونكە لەپاش گەڕانو پرســیارەكی زۆرو بڕینی سەدان كیلۆمەتر لـــە هندێك ناوچـەكانـــی كوردستانی ڕەنگـــیندا نەمانتوانی دانەیـەكی‌تر لـەم دەستنووسە پەیدا بكەین •

## باس كردنی دەستنووسەكە

دەستنووسی بەرصیصی عابید بەشێكە لە دەســتنووسێك كـــە قەبارەی (٢٥ × ١٥سم) و ٢٨ لاپەڕەیەو هـەر لاپەڕێك ٢٣ دێڕەو تەنیا دووسێ لاپەڕە نەبێ هەر دێڕێك دوو مالكە شـــیعری تێدایەو بە مرەكـەبی ڕەش هاتوەتـــە نووسینو خەتەكەی زۆر جوان نی‌یە • دەستنووسەكە كۆن نی‌یە چونكە لـــە ساڵی ١٩٦٩ هاتوەتە نووسین لە لای محمد علی كوڕی حاجی رەشید كەفشـنی لە گوندی (بارمێ) لـە ڕۆژئاوایی جزیرا بۆتان • دەســـتنووسەكە بە شێخی صنعانیان دەست پێ ئەكا هەتا لاپەڕی (١٦)

٢ ـ بەرصیصی عابید لە لاپەڕەی (١٧) دەست پێ ئەكا هەتا (٢٦) •

٣ ـ هەڵبەستی « ئەی ئافو ئاف »ی فەقێی تەیران لە دەستنووسەكەدا هەیە ، (٦٨) دێڕە شیعرە • بەڵێ دوو دێڕ لە كۆتاهی‌یەكەیدایە هەڵبەستێكی‌ترەو لەم هەڵبەستە نی‌یە • ئەم دانەیە لەم هەڵبەستە پێ ئەچێ تەواو بێ چونكە

لە چەند دانەیەکیتر کە بەرچاومان کەوتووە تەواوترە •

٤ ـ هۆنراوەکیتر یێ تەیران تێدایە کە پێشەکییەکەی ئەمەیە :

**ئیرۆ وەرن لازم وەرن**
**جیرانو خەلکی هیشەتی**

بە خەتێکیتر ١٢ دێرە شیعر لە کۆتاهییەکـــەیدا هەیـــە یی شاعیرێکی نوێیەو پێشیاوی ئەمەیە « گەلی فەقێیان » •

چیرۆکا بەرصیص لە (٤٢٢) دێرە شـیعر پێكهاتووەو ئـەم (عیبارەتەی) خوارەوەی لەسەر نووسراوە :

« ژ دیوانا فقهی طـــیران بحسا برصیص عابـــد دەگوتیـــــە خودازی راضی بی » •

پێشیاوی یانێ پێشەکییەکەی بەرصیصی عابید ئەمەیە :

**گوهدنە پیری دەفتەران**
**دا ئەز بخونم فی خەتی**

لە کوتایەکەیدا ئەم دێرانە هەیە :

**بی حساب (مکسی) خەبەردان**
**ژیاریا قەلسو نەمەردان**
**ری نەدامەت بی بسەردان**
**میمو حی ب روایەتی**

**میمو حی ئەڤ بەند دگوتن**
**ئەم بمەعنایی قەهوتن**
**عوجبی گشت خیران دشوتن**
**لەو ریا بکێر نەتێ**

**فیعلا خراپ خودبینییە**
**عوجبی نەکن لدینییە**
**دەر با سەراسەت مسکنییە**
**ژ دەرویشیو حەقارەتێ**

وەها دیار دبێ کە ئەمە بەرهەمی تەیرانە چونکە دوو جار نازناوی یان بڵێین (ڕەمز)ەکەی ناوی « میم‌و حی »یە تێداتی • بێ‌گومان ناوی تەیران (محمد)ەو هەروەها نازناوی «مکسی»ش تێدا دەبینین • هەروەها وشەی « مکسی » لە دێڕی (٢٨)داش هاتوە • فەقێش خەڵکی بازاری مکسی بوویە کە لە کۆنەوە جێگەی خوێندن بوویەو خۆندگاها (مەدرسا) میر حەسەنی وەلی بناووبانگ بوویە •

## ناوەرۆکی چیرۆکی بەرصیص

ناوەرۆکی ئەم چیرۆکە ، هەروەکو لە دەستنووسەکەدا هاتوە ، بەکورتی وەهایە :

بەرصیصی عابد زۆر لە خواترس بوە لە وڵاتی شامێ بە شەوو بە ڕۆژ ئیتاعەتی خوای ئەکرد لە ئەشکەوت‌و کونە بەردەکانی شاخەکاندا لەگەڵ پەزی کۆڤی (حەیوانە کێوی) دچیری‌و دژیاو خواردنی ئاوو گیا بوو تا کرو زەردو لاواز بوو و ناوقەدی چەمایەوە تا وەکو پیتی دال (د)ی لێ‌هات • بەرصیص گەیشتە پلەی ئەولیایەکانی خواو ناوی لە رۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوادا بڵاو بوو و خەڵك ئەچوون بۆ دیتنا وی‌و بیمارەکانیان ئەبردن لای‌و بەدوعایەکانی چاك ئەبوونەوە ، بەڵام لەگەڵ ئەمەش بەرصیص بێ شێخ‌و بێ‌ڕەهبەر بووە • شەیتان زۆر هەوڵی ئەوەی ئەدا کە ئەم عابیدە لە ڕێگەی ڕاست دەرخا بەڵام بێ‌سوود بوو تا جارێك لەگەڵ کورەکانی کۆبووەوەو گلەیی لێ‌یان کردو گوتی ئەگەر زوڕیەتم هەبایە بەرصیص وها نەدەما • بەڵێ شەیتانەکی بچووك کە بە ناوی « وەسوس » بوو وەڵامی (باوکی) دایەوەو گوتی · خەمت نەبێ بەرصیص لە ملی من‌و ئەبێ ئەمن لە ڕێگەی دەرخەم‌و هەڵخەڵەتینم • ئەم شەیتانە جل‌و بەرگی عابیدانی لەبەر کردو چوو بۆ جێگایەکی نێزیکی بەرصیص‌و دەستی بە ئیتاعەت کردن کرد بە شەوو بە ڕۆژ وە بەرصیص زۆر سەری لێ

سوورِ ما له دڵی چەسپا کە ئەم مرۆڤە زۆر پیاوەکی ساڵحو چاکە • بەرصیص چوە لای وە بوون بە هەڤاڵی یەکترو پێکەوە نوێژو ئیتاعەتیان ئەکردو باسی پێغەمبەرەکانو پیاوچاکانیان ئەکرد • بەرصیص (٦٩) ساڵ بو عیبادەتی ئەکرد • بەم شێوەیە ڕۆژێك هەڤاڵەکەی پێی گوت ئەبێ شێخو ڕابەرێکت هەبێ • ئەویش گوت ڕابەرم (خضر)و (الیاس)ە • ئەم پێ گوت ئەگەر مەن بکەی بە ڕابەرتو شێخت دەتخەمە سەر چەنگی خۆمو ئەفڕینو دچین مەقامی بڵندی خوایی‌و لەسەر دەریایەکان ئەفڕینو هەر دەست بەجێ چەنگو پەڕ لە (ابلیس) پەیدا بوو بوە تەیرەكو بەرصیص لەسەر پەڕی سوار بوو فڕی لەسەر دەریایی عومانەوە • ئیتر بەرصیص چاك باوەڕی پێ هاتو شەیتانی کرد بە شیخی خوی •

میرەكو دەسەڵاتدارێکی دەوڵەمەند هەبو کچێکی یەکجار جوانو شۆخو شەنگی هەبو و زۆر لە لای خۆشەویست بوو شەیتان چووە خەونی کچەکە لەشێوەی پیرێکی دەمو چاوی وەك یی بەراز بوو وەکو کابووسو زەبانیەکی ئی جهەنەمێ بوو • هەر دەستبەجێ بوو بە سەگە تانجی‌یەك بەگوێیدا قیڕاند • دوایی کچەکە لێی بوو بە تاو لەرزو جوانی‌یەکەی تێكدا • باوکی چەند ئەستێرەناس (منجم)و (رمال)و فاڵگرەوە بوو هەمووی کۆکردەوە بۆ ئەوەی بزانن نەخۆشیی کچەکە چی‌یە • بەڵام ئەوان چەندیان هەوڵدا دەستیان کتیب نەدەگرت ، حیسابی « ئەبجەدی » لێیان غەڵەت ئەبوو ، هەندەك پیتی نوێ تێکەڵ حیسابیان ئەبوو لێیان تێك ئەچوو و پیتی(ئەلف) نەدەهاتە نووسین • سەریان سوورِ ماو هەموویان گوتیان ئیسمو تەلەسم لێ نی‌یە بەڵکو چاویان لێداوە • پاش ئەوەی هیچ هیوایەکیان نەما ، ئیبلیس چووە خەونی دایكو باوکی کچەکە • پێی گوتن ئەگەر حەز ئەکەن کچەکەتان چاكبێتەوە کچەکە برازێننەوەو بیبەنە لای برصیص با شەووڕۆژێك لەلای بمێنێ وە تاکو سێ شەو چووە خەونیان • باوکی پرسی بە وەزیری خۆی کرد

بەلاّم وەزیرەکە بە جێبەجێ کردنی خەونەکە ڕازی نەبوو ، گوتی ئەم ئیشە حەرامە • میرەکە بەقسەی وەزیرەکـەی نەکردو کچەکـــەی بە جوانترین جل‌وبەرگ ڕازاندەوە بردیان بۆ لای برصیص تا چاکی بکاتەوە • بـــەلاّم برصیص تەماشای جوانیی کچەکەی نەکردو بەلایەوە نەچوو تا ئیبلیس چـــوو بۆ لای کچەکەو دەستی کرد بە گریان بۆی پەردەی لەسەر ڕووی کچەکـە لادا ، داوای لە برصیص کرد کە چاکی بکاتەوە لە نەخۆشی‌یەکەی • کاتـــێ برصیص چاوی بە کچەکە کەوت تەیری دڵی فڕی‌و لە جوانیی کچەکـــەدا نقوم بوو وە خۆی پێ ڕانەگیرا • ئیشی خراپی لەگەڵ کرد بەلاّم پاشان زۆر پەشیمان بووە بە ئیبلیسی گوت کە بە شێخی خۆی ئەزانی کـە ئەم گوناهـەی کردوە • ئەویش پێی‌وت تۆبە کردن هەموو گوناهەک ئەبات • بەلاّم ئەترسم کچەکە ئاوس بێ • وا باشترە کچەکە بکوژی‌و بزری بکەی بۆئەوەی تووشی شەرمەزراری نەبین • برصیص کچـەکەی کوشت‌و لە شوێنێك شاردیەوە • شەیتان دیسان چووە خەونی باوکی کچەکەو پێی‌وت برصیص کچەکـــەی کوشتوەو لە فلاّن شوێن شاردوویەتەوە • باوکی کچەکە هات برصیصی گرت‌و کچەکەشی لەژێر خاك دەرهێنا • فەرمانی‌دا برصیص لە سێدارە بدەن • کاتێ خەریك‌بوو لە سێدارەی بدەن شەیتان بەرامبەر برصیص ڕاوەستا • برصیص لێی پاڕایەوە کە ڕزگاری بکات ، ئەویشی پێی‌وت ئەگەر سوجدەم بـــــۆ بەی ڕزگارت ئەکەم ، ئەویش سوجدەی بۆ بردو لە دین‌و دیانەت دەرچوو • ئەوجا شەیتان خۆی پێ‌ناساندو برصیصیش لە سێدارە دراو حەفتا ساڵ عبادەت کردنی هەمووی بەخۆڕایی چوو •

بەم جۆرە بەسەرهاتی برصیص لە دەستنووسەکەی فەقێی تەیـــراندا کۆتایی پێ دێت • هیچ گومانی تیا نی‌یە کە تەیران ئەصڵی چیرۆکەکەی لـــــە هەندێ کیتابی ئایینی وەرگرتووەو لـە لای خۆشی هەندێ گەشەی پێداوەو بەشێوەیەکی زۆر جوان‌و ڕێك‌و پێك ڕێکی خستووە •

ئەوەی شایانی باسە ئێستا لە هەندێ ناوچەکانی کوردستان وەك ناوچەی بادینان ( عیبادەتی بەرسیس ) بوویتە پەندو باو (ضرب المثل) • ئەگەر رەنجو خزمەتی کەسێك بەفیڕۆ بڕوات پێی ئەڵێن وەك عیبادەتی بەرسیسی لێ هات •

## بنچینەی مێژوویی چیرۆکەکە

«برصیص» « برصیصا » ناوێکی عیبری یان بێژین ئارامی‌یە لە دوو وشە پێك‌هاتوە «بر» و «صیصا» • وشەی «بر» لە ئارامی‌دا مانای کوڕەو زۆر ناوی وەها هەیە وەکو « بردیصا » و « برصوما » و « برصیص » و « برعیتـــــا » • (برصیص) واتە کوڕی صیص • بەسەرهاتی ئەم پیاوە ئایینی‌یە پیش ئایینی ئیسلام ڕوویداوەو لە ئایینی (یهودی)دا هەبوەو پاشی تێکەڵ ئایینی ئیسلام بوە ، وەکو زۆر بەسەرهاتی‌تری ئیسرائیلی‌یەکان • بەلام ئایا ئەم بەسەرهاتەی بەرصیص تێکەڵ ئایینی عیسا بووە یان نا ؟ دەربارەی ئەمـــە پرسیارێکـم نارد بۆ کوڕی زمانی سوریانی (مجمع اللغة السريانية)و کوریش بەنامەی خـۆی (نمره١٠/١٧٩ بەمێژوویی ١٦/٧/١٩٧٨) ولامیان دامەوە و ئەڵێن : بەسەرهاتی بەرصیصمان لە هیچ سەرچاوەیێکی سوریانی‌دا نەدیتوە •

هەر لە زوووە ئـەم بەســـەرهاتە تێکەڵ ئایینی ئیســـلام بوەو زۆر لــە موفەسیسرەکان کردوویانە بە مانای ئەم ئایەتەی قورئان (ئایەتی ١٦ لەسورەتی الحشر) « كمثل الشيطان اذ قال للانسان اكفر فلما كفر قال اني بريء ، اني أخاف الله رب العالمين » •

بەپێی هندێك ڕیوایەت ئەم بەسەرهاتە ـ بە بێ ناوی بەرصیص ـ لـــە پێغەمبەر هاتیە وەرگرتن وەکو ڕیوایەتی سهیل ( التعريف و الاعلام ص ١٢٧ ـ ١٢٨) چاپی میسر )وسیوطی ( الدر المنثور ٦/٢٠٠)و ابن الجوزی ( تلبیـــس ابلیس ٢٦ ـ ٢٩ ) • بەڵێ ئەم ڕیوایەتە کزە بەڵکو بەهێز ئەوەیە کە ئەچێتەوە سەر (علی) کوڕی (أبی‌طالب) وەکو طبری باسی کردیە لە تەفسیرا خۆدا (ب٢٨،

ل ۳۳)و هەروها (الحاكم) له (المستدرك ب۲ ل ٤٨٤) • طبری به سـنێ ڕیوایەتی‌تریش بردوویەته سەر ابن عباس‌و ابن مسعودو طاوس‌و لەپێش طبری‌یش هندێك زانایان باسی کردنه وەکو عبدالرزاق کوری همام (۸۲۸زا)و بخاری (۸۷۰زا)و ابن اسحاق (۸٤۷زا)و احمد بن حنبل (۸٥٥زا) • دوور نی‌یه أبو اللیث السمرقندی یەکەم کەس بێ ناڤی بەرصیص « برصیصا »ی لەگەڵ ڤێ بەسەرهاتیێ هێنابێ‌و گوتبێ ئەو عابید ناوی «برصیصا» بوویه • ( بغوی )ش پاش وی گوتیه ئەو عابیده برصیصا بوویەو پاش وان گەلەکی تریش وەکو وان گوتیه •

چیرۆکا برصیص گەیشتووە ئاورووپاش له ڕێگەی (کتاب الاربعین وزیرا)و هندیك له ئاورووپایی‌یەکان باسیان لێ کردوەتەوە وەکو هارتمان‌و گۆلد سیهرو لاندبرج‌و شوفان‌و ماسینیونیش له چیرۆکی بەرصیص کتێبەکەی وەرگرتووە بەناوی : AMBEROSIO OR THE MONR

ئەم زانیاری‌یەو هندێك زانیاری تریش به درێژی دەربارەی ئەم بەسەرهاته د (دائرة المعارف الاسلامیة ) بەحسا : «برصیصا» دا هەیه •



تۆ تۆی دەروونم بگێلە پێشدا
ئەر تۆ دیت تۆیێ غەیرەز تۆ تێشدا

ئازیز ، مەئدوون با باوەرەش وە بەر
وە مەودای موژە پارە پارەش کەر

ـ مەولەوی ـ

# چەند پیناسینەک

عبدالرحمن مزوری

**١ ـ ئـەلنـــد :**

بەلاتینکا خۆ دسۆژیتن ..
ژبەر ئەڤینەکا ،
پاقـــژ
چرا خوینا خـــۆ دڕیژیتن ..
دا باربکەن ،
تاری‌و دژ
رویبار سترانا دبیژیتن ..
داکەزیێت شەنگەبیا ،
واسیی نەمینن
گـــژا فـــژ
ئەزی لـــەوان
پشتا شەڤا ژ دل دقڕینم ..
دا هەلێتن ئەلندەکا ،
بێ تەم‌و مـــژ
بێ تەم‌و مـــژ

**٢ ـ خەریتـــە :**

سیلاڤ هەمی من ڤەخاندن ..

جوانتر ژ سیلاڤا پرچا تـــه ،
من نەخاندیە
لەعل هەمی من جەماندن ..
جوانتر ژ لەعلا لێڤا تـه ،
من ژ کانگەهـــا
نە جەماندیە
دەریا هەمی من شلقاندن ..
جوانتر ژ دەریا ڤینا تە ،
چو جارا من
نە شلقاندیـــە
گەلەك خەریتە من چانـــدن ..
جوانتر ژ خەریتا بەژنا تە ،
دڤی دلیدا
من نەچاندیـــە
من نەچاندیـــە

٣ ـ ڕەهـ :

گەر پەڕێن مێوێ ببڕن ..
دێ دەتن ئویشیی‌یا ،
گەلەکـــا
گەر سەرێ تەیری ببڕن ..
دێ کەڤیتە ،
چەرخا گۆڤەندو حەنەکا
شڤێ ژ تڕاشێ ببڕن ..
دێ بیت گوپاڵ ، ژ بـــۆ زەندێن

خورته شڤانو چەلەکا
ڕەهێن مژی هوین ببڕن ..
وەك فریزی دێ ڤەگرم ،
لاتو مشارو کەلەکا
لاتو مشارو کەلەکا

**٤ ـ وەلات :**

نەمن گەنجو خزینەنە ..
ئەفرو ژ بەژنا تەڕا ،
بدەم
نە من پەلکە زێڕینەنە ..
هنداڤ سەرێ تـــە ،
ئەز ڤەدەم
نە من ستـرانو لاوژەنە ..
بۆ تـــە نە بێژم یان نەدەم
وەلاتێ من
من چ هەیە ؟!
ئەڤە دلێ من سێڤەکا بەرواریانە ..
دێ هاڤێژم ،
لسنگێ تە دەم
لسنگێ تە دەم

---

**پەیڤێن گران :**

ئـەلند = بەربانگ ، کازیوە ، الفجر .
بەلاتینک = پەپولە ، پەروانە .

گزاڤژ = پەرێشان ، أشعث •
نویشیی = هێشو ، عنقود •
فریزی = الشیل ، الائل •
دسوژینن = دەسووتێنێت •
پاقژ = پاك •
تاری = تاریك •
ستران = گۆرانی •
واسی = ئاوا •
حەنەك = گاڵتە •
ڕەھ = ڕەك •
هاڤێژم = بیهاوم •



## دوو سێ دێڕیتری بەشیرنامە

– ١ –

**هەرکەسێ هاتو گەزافیدا وتی کوردم ئەمن**
**زۆر سکاڵای خۆتی بۆ نەکەی تاکوو تەواو تاقیی نەکەی**

– ٢ –

**خودا تا کەی ئەم کوردە بێسەرو گرفتار**
**وەك سوڕسوڕە ماڵ لێتێکچوو بێقەرار**

لەبەر دەستخەتی مامۆستا بەشیری ڕەحمەتی ، خۆی ، نووسراوەتەوەو ڕێنووسەکەی دەسکاری کراوە

# بەسەرهاتی سەرە بڕاوەکە

**موحەممەد بەڕپادەی مەغریبی**
نووسیویە
**حسێن عوسمان نێرگسەجاڕی**
کردوویە بە کوردی

کە سەرم لە لەشم جیاکرایەوە ، خوێن لەسەر زەوی جۆگەلـــەی بەستبوو ، لاشە بێ گیانە بێ نازەکەم بەتەمابوو گالێسکە یا ئوتۆمبیلێك لەگەڵ زەوی‌دا یەکی بخاتەوە ، فەرمانم دا بە دەستم کە دووری بخاتـــەوە ، بەلام لەدوایی‌دا زانیم کە ئیتر دەستەکانم لەژێر فەرمانی من‌دا نین ، شادەمارو ڕەگە وردەکان قوڵپیان ئەداو فوارەی خوێن هەتا ئەهات ئەو ناوەی ئەدایە بـــەر ، وەك بیانەوێت پرۆژەیەکی دەریاچەی سوور بـــۆ سەیرانگا دروست بکەن !!

ئەڵێن مرۆڤ خوێن ئەیگرێت ، منیش وەك دەرکەوت خوێن گرتبوومی‌و بەدیاری لاشەکەمەوە قنج‌و قیت وەستابووم ، تەماشای جۆگەلە سوورەکانـــم ئەکرد . خەڵکەکە نەیان‌ئەویست گوێ‌یان لە تەقە بێت‌و چاویشیان لە خوێن ، بە هیچ جۆرێ لایان لێم نەئەکردەوە. گوێم لە پیرێکی نوێژکەر بوو کە خوێنەکەم لە نوێژی بردبوو ، لەبەرخۆیەوە ئەی‌بۆلاند : لا حول ولا قوة الا بالله .

ئەوەی سەری بڕیم نە دیومەو نە ئەی‌ناسم ... جا چیی تیایە هیـــچ باکم نی‌یە ، خۆ سەرم لە هەڵس‌وکەوت‌و زوبانم لە دوان نەکەوتـــوون !! ئاهێکم تێ‌گەڕاو بزە گەڕایەوە سەر لێوم ، چاوەکانم زڵتەیان ئەهات ، ئۆقرەم

لێ هەڵگیراو کەوتمە مشوور خواردن :ــ چۆن ئەم سەرە بڕاوەم لە سەرنجی زۆربلێ‌و فزوولی‌یەکان ڕزگار بکەم ؟

دیمەنەکە ئەوەندە سەیر بوو ئەترسام لەگەڵ لاشەکەم بمانخەنەوە یەك‌و لە چاڵێکدا بمانسرەوێنن • چاوم نووقاندو هەموو بیرو هۆشم کۆکردەوە • لە پتێکدا بەمشێوە سوودم لە «یۆگا» بینی • لەبەرخۆمەوە ئەموت خوایە دوو باڵم بدەرێ خۆم ڕزگار بکەم بەڵکو بـۆ یەك ڕۆژیش بووە بژیم ، کە چـاوم کردەوە بە بێ‌باڵ مەلەم ئەکرد لە ئاسماندا ، بڕیارم‌دا بەرەو باشوور بڕۆم ••• (ڕەبات ــ رباط)م لە ئاسمانەوە وەك شوێنێکی پۆخڵەکراو ئەبینی ، نەخێـر وەك ڕێوی‌یەکی گەڕ بوو ، نەخێر شمشێرێکی ژەنگاوی بوو ، نەخێـر نەهەنگێك بوو لە قوڕگی دەریادا ، نەخێر شـانێکی بێ‌هەنگ بـوو !!

هەناسەیەکی قووڵم هەڵمژی‌و خۆم لە تیشکی گەرمی ڕۆژ هەڵکێشـا • تووشی پۆلێ باڵندە هاتم • ترسان‌و لە سەری مرۆڤێك سڵەمینەوە کە هاتۆتـە ئاقاریان‌و خەریکە جێگەیان پێ لێژ کات • دەریا لە بەرچاوم ون بوو • خوار خۆمم بە یەکسان ئەبینی :ــ دەستێکی بەرینی بێ‌گری‌و بێ‌نهێنی ، لەپشـت ئەڵەفەکانی مێشکمەوە • پرسیارم لێ ئەکرا :ــ ئەی خاوەنی سەرە بڕاوەکـە کە هاتیتەوە سەر زەوی چی ئەکەیت ؟ بە هەموو توانایەکم وزاقم ئـەدایـە خۆم ، خێراتر ئەبووم ، لەوکاتەدا لەوە گەیشتم کە بۆچی عەباسی کوڕی فەڕناس شەیدای گەشتی ئاسمان بوو • پێویستە هەموومان ناوبەناو لە زەوی دوور بکەوینەوە بۆئەوەی زۆرتر تاسەی ژیانی بەرەلایی بکەین • من هەرگیز بـۆ لاشەکەم بەپەرۆش نیم • چونکە ئەتوانم بدوێم ، بفڕم ، ببینم • بڕوا بکەن ئەوەندە هۆشم پوخت‌و خاوێن بوو ، ئەوەندە زیرەکیم تیژو بەبڕشـت بوو نەمخستایە کـارو کولم نەکردایە شێت‌و پەتیارەیی دەسـتی مـاچ ئەکردم ، هەر لەبەرئەمە بوو بڕیارم‌دا لە یەکەم کۆمەڵێکا تووشی بێم بنیشمەوە• لەوانەیە ناوچەی مزگەوتی « الفنا » بێت ، بڕیارم‌دابوو بۆڕی هەمـوو

شانامەخوێن‌و شایەرەگان بدەم ، خولێکی زیکنم دا بەسەر عەشاماتەگـــەداو هەموویانم داچڵەکاند ، چاوو پەنجەی هەموویانم بەرەوژوور کـــردەوە :ـ سەری مرۆڤەو ئەفرێت !! کۆمەڵێکی هەمە چەشنەی هەمەچیزە دامیانە ناو ، ئەوەندە بەتاسەبووم بدوێم وشەکان وەك پشکۆ هەڵئەوەرین‌و لە خۆمـــــم دوور ئەخستنەوە :

ـــ ئەی کەساسە چەوساوەکان ! ئەی ئاوارە بێبەشەکان ! هەمیشە ئێـــوە بەتەمان ، لە ژیانی ڕاستەقینەتان ڕائەکەن ، خۆتان بە ئەفسانەو پڕوپووچ ژێـــر ئەکەن ، ڕاست تووشی شەوارەتان ئەکات ، بە هاشەو هووشە خۆتان سڕ ئەکەن، خەو بە وڵاتی واق‌واقەوە ئەبینن ، ئەتانەوێت بێئابڕووە پاژنە عانەکان بـــە مەمکی ئارەزوو ژێرتان بکەن ، ئارەزووە چڵێس‌و سەرکوت کراوەکانتان کـــە برسێتی‌و بێنەوایی کپی کردوون ، بەتەمان ئەو سۆزانی‌و حەشەری‌یانە بۆتان دابمرێننەوە ، ئەی بێدەرەتانەکان ! هاتووم لـــە دەروازە ژەنگاوی‌یەکانتـــان ئەدەم ، ناختان ئەهەژێنم بۆئەوەی کاژی بێدەنگی فڕێدەن ، هەموو شتێـــك ناوی ڕاستەقینەی خۆی لێ بنێن ، دەستبکەنە ملی ئەو دیاردەو هێزانەی کـــە بەئاشکراو ڕۆژبەڕۆژ لەبرەودان •

وشەکانم بەخێرایی بازرەقەیان ئەبەست ، وەك هەور ئەیان گرمـــان ، ئەمویست لە بنی هەمانەکە بدەم‌و تەنانەت ئەوشتانەش بدرکێنم کە لە خۆیشم حەشارداون ، ئەوانەی لەدەورم بوون بێدەنگ‌و سەرسام ، هەندێکیان بە باشی لە وتەکانم ئەگەیشتن ، هەندێکیشیان کەوتبوونە ورتەورت :ـ

ـــ ئەم بیچمە چڵێتە چی‌یە ، سەیرکەن چۆن زمانی لە چەرخ داوە !!

ـــ لەوانەیە پارچەیەکی وێڵی ئاسمانەکان بێت •

ـــ نەخێر سەرێکی لە ئامێرە ئەم فەرمایشتانەی تیا تۆمار کراوە !!

ـــ هەرچی‌یەك بێت نابێت چاو لە جنێوو ترۆکردنمان بپۆشین • منیـــش

پێش ئەوەی بەتەواوی هەلم لەکیس بچێتو دەمکوتم بکەن ڕووم کردەوە عەشامەکە :ـ

— چەندتان بێ ئیشن ، بێ گومانم جگە لە گەڕیدەو جاسووسەکان هەمـــوو بێ ئیشن • جارێك ئەپرسن بۆچی بێ ئیشن ؟ بۆچی ئێوە بەگەنجـــی دائەچۆڕێنو پیر ئەبن ؟ بەرچاییو شێوتان ئەفسانەیەو پاشماوەی مارو مێروو پشیلەو سەگە ، لە بەشی ناوخۆی ڕۆژنامەکاندا بەرچاوم کەوت کە خۆتان پیشانداوەو داوای ئیشتان کردووە ، بەڵێنتان پێدراوە کـــە شۆستەی جادەکان ڕێك بخەن ، بۆ پرسیار ناکەن جیاوازیی ئێوەو خاوەن ئوتۆمبیلە باڵدارەکان چی یە ؟ بۆچی ئەو گۆڕەبانو شەقامانە بـــوونەتـە گۆڕستانێکی بەربلاوی زیندووە مردووەکانو تا کەی ئێوە ڕازین کـــە پیاو چاكو دڵپاك بن ، بە ناوی ئێوەوە خواپەرستی بکرێـــتو ستایشی یەزدان بکرێت کە نازو نیعمەتی بەخشیوە ؟ ئێوە باشترین ملکەچـــی بارەگای یەزدانن ، بە قەزاو قەدەری ڕازین ، بە برســـێتیو ڕووتو ڕەجاڵیتان لەم وڵاتە پڕ پیتو فەڕەدا ڕازین !! ئەگێڕنەوە لەکۆنـــدا جوامێر ئاغایەك بوو بەیانیان کە لەخەوی شیرین هەڵئەسا کاوڕێکی ئەکرد بە کەباب بـــۆ بەرقلیان ، لە نیوەڕۆڕا (٤٠) مریشکێکی بــە ڕۆنـــی مانگا بـــۆ سوور ئەکرایەوەو مەشکەیەك شەرابی ئەکرد بەســـەراو خۆی ئەدا بە خـــۆر ، لەپاش مردنیشی بە مەستیو تێرو پڕی بەخزمەت خوا گەیشت ، بەڵام ئێوەی ڕووتو ڕەجال وان کـــە لە ترمـــزیو ئەبوودەرداوە ڕیوایـــەت کـراوە کـە پێغەمبەر فەرموویەتـــی :ـ باشترین کەسی گرۆی من کۆمەڵی هەژارو ڕووتەیە •

— ئەم سەرە براوە لە سنووری دەرکردو پێی لێ هەڵبڕی ، ئێمە بـــە کەساسیو هەژاریی خۆمان ڕازین ، ئیتر بۆچی برینەکامـان ئەهێنێتەوە سوێ کاربەدەستان بۆچی لەم ئاژاوەچی یە ئاگادار نین ؟

— کاربەدەستان ئەدەن بەدەمیەوە هەتا هەرچی لە هەگبەکەیدا هەیە هەڵیڕێژێو بشزانن کە ئایا پەنجەی بێگانە لەپشت ئەم قسە زلانەوە نی‌یە ؟ یەکێکی کە هەڵیدایەو خۆی تکاندە باسەکەوە :ـ

— بەڵام سەیرە ••• کون لە جەرگیا نی‌یە •• تازە لە چی بترسێت ؟ لە لەشی دوورخراوەتەوە کەچی هەر لە قسەی خۆی ناکەوێت ••• خۆ شتی زۆر ڕاستیش ئەدرکێنێ ، بە لای کەمەوە خۆ درۆزن نی‌یە !! منیش بە هەر چوار لادا فڕکەم ئەهات • لە هەموو دەمو چاوەکان تێڕائەمام ، درۆ نەکەم لەوکاتەدا زۆریش لە خۆم ڕازی بووم :ـ گۆمێکی شڵەقاند ، دەرگای مشتومڕێکی خەستم کردەوە ، چەند ئاوازێکی تازەم دا بەگوێی جەماوەردا ، لەپڕ عەشامەکە بەیەکدا هات‌و دڕی‌پێدرا • پێش‌ئەوەی تۆڕی پۆلیسەکان هەڵم‌لووشێت لە ناخەوە تێر پێیان پێ‌کەنیم ، هیچ هەوڵی دەربازبوونم نەدا • بەمە زۆرتر کەوتنە گومانەوە • لە هەموو لایەکەوە دەنگ بەرز بوەوە ، شتەکە گەورە بوو ، گوێم لێبوو بانگی لێ کردن :ـ « دەستی لێ مەدەن لەوانەیە زەهراوی بێت یاخۆ بتەقێتەوە ، بام لە قەفەزدا بێت هەتا دادگا » •

لەناو قەفەزەکەدا وەك تەرم خرابوومە سەرشان ، بڕوا بکەن وەك پیاوێکی پایەبەرز مردبێت لەوەش زۆرتر جەماوەر شوێنی من‌و ئەم گاوگەردوونە کەوتبوو • منیش لەوپەڕی خۆشیدا بووم ، بسکەی سمێڵم ئەهات ، تەماشای جەماوەرم ئەکرد ، پۆلیس بە لیس کەوتبووە وێزەیان ، لە قەفەزەکەوە «سەرم!!» دەرهێناو هاوارم‌کرد :ـ

— خواتان لەگەڵ ! جوامێر ئاغاتان نەیادنەچێت ! داوای مافی خۆتان بکەن • گۆشت مریشك‌و پەرواری‌و ژیانی پڕئاسوودەیی‌تان لەیادنەچێت ! پرسیار بکەن ! بیربکەنەوە ! داوا بکەن •••

عەشامەکە هاواری ئەکرد :ـ لێی گەڕێن بام خەشی دڵی خۆی بمرێنێ ، تازە هیچی لەسەر نەماوە ، ئەی دەستی قەسابەکەی خۆش بێت بـــۆ خۆیو کوشتاری !!

بەر لەوەی بمخەنە ئوتومبیلێکی قەبەوە بانگم کرد :ـ

ـــ داوا بکەن بام دادگا ئاشکرا بێت !

لە ماڵە گەورەی شار دانرابووم ، لەوە گەیشتم کە مەسەلەی مـــن زۆر قووڵەو گزیرو قازی کەوتوونەتە مقۆ مقۆ ، نە ساختە نە فێڵ نە دەقی یاسا ڕزیوەکان ، نە هەڕەشەو گوڕەشەو فیشاڵ فریای ئەوان ناکەوێت ، پینەی لاشە قێزەونەکەیان ناکات ، گەورەی شارەکە سەر تا پا سپی‌یەکی باڵابەرز بوو تەکێکی دا بە لامەوە ، خۆی زۆر بە ویقارو ئاغر پیشان‌ئەدا :

ـــ ئەمە گێچەڵو شەڕفرۆشتن نی‌یە ئەی خاوەنی سەرە براوەکە ، لـــە دوورەوە هاتوویتە ئێرەو ئەتەوێت گەرای ئاژاوەو گۆمڕایی بچێنی ، بێ‌گومانم لەمەوبەر وڕێنەت کردووە ، مەستی خەوی بێداریـــت • ئێستەیش ئەتەوێت ئەو خەوانە بکەیتە گەرای ئاژاوەو ژەهراویو لـــە مێشکی ئەم خەڵکەدا بیچێنیت • منیش ئەمویست درێژە بـــە پرســـیارە ژنگاوی‌یەکانی نەدات :ـ

ـــ هاتووم بۆ ئێرە ، وێڵی لاشەکەی خۆمم ، بیستوومە لە باشوورە •

ـــ چەند زۆرزانی ، هەموو دوانـــەکانـــی مزگەوتی «الفناء»تمان پـــێ گەیشتۆتەوە !

ـــ جەماوەری میللەت لەلای من سیحرە ، جادووە ، من لەوبڕوایەدام کـــە هەرچی شتی سوودبەخشو بەنرخ هەیە لە زیرەکی ، کارامەیـــی ، بلیمەتی لەوانەوە هەڵئەقوڵێو گەشەئەکاو بەرئەدات ، ئیتر بۆچـــــی

جەنابتان لەسەر خەفەکردنو سڕکردنی ئەم سامانە لەبن‌نەهاتووە سوورن ؟ منیش ناچارم پەنام بردۆتە بەر ئەو کوتەگۆشتەی کە پێی‌ئەڵێن زمان !!

— تۆ یاری بـــە ئاگر ئەکەیت •

— جا من باکم چی‌یە •• ئەی نابینی میران مردن چۆن منی سمیوەو هیچی پێ نەکردووم !!

گەنجێکی کەتەی قۆز بەپەلە هاتو بە گوێی گەورەی شاریدا چرپاند • دیسانەوە گەورەی شار ڕووی تـــێ کردمەوە :ـ

— هیچ داوایەکی تایبەتیی خۆتت هەیە ؟

— ئەمەوێ کۆڕێکی عەشام جەم‌بێتو بۆیان بدوێم •

— داواکەت وەرنەگیراو پەسەند نی‌یە ، پێویستە بدرێیت بە دادگا •

— بە چ‌یاسایەك خۆ من لە گرۆی مردووی گۆڕستانم ؟!

بە زەردەخەنەیەکی لەخۆبایی‌بوونەوە وەك باشترین پینەیان دۆزیبێتـــەوە هاتەوە گۆ :ـ

— یەکێ لە قازی‌یە مردووەکانی خۆمان ئەهێنین تاکو لەگەڵتا بیبڕێتەوە • لە سووچێکی قەفەزەکەدا خـــۆم مت‌کردبوو ، ساتە ناساتێکیش دەنگی ئەم هاوارە ئەگەیشتە گوێم :ـ بژی خاوەنی سەرە بڕاوەکە • کاتـــێ چاوم کردەوە ڕوناکی‌یەکی بەتین نوقمی کردم ، هۆڵی دادگا کــــرا بە چراو چراخان بەتایبەتی قەفەزەکەی من ، هۆڵی دادگا جمەی ئەهات لە پیاو ماقووڵانی شـــار ، لــــە گـــەورەو خاوەن نیشـــانەکـــان • هەمان زەردەخەنەی ساردو سڕ نیشتەوە سەر لێوی گەورەی شـــار ، پەشۆکاوو شپرزە بوو ، بەپێچەوانەی ئەوەوە منیش زۆر هێمن‌و بگرە

پێکەنینێکی گاڵتەجاڕیم لێ پڕابوو ، پاش تۆزێك دەنگێکی گڕی لەرزۆك جاڕیدا :ـ

— سەعادەتی پاشای بەغدایی لە مەرقەدی موبارەکی خۆیەوە تەشریـــف ئەهێنێ بۆئەوەی مەسئەلەی سەرە بڕاوەکە بگەیەنێتە ئەنجام •

سەیرو سەمەرەیە ••• شاگەشکەم کرد ئەوەند پێیان پێکەنیم [هێشـــتا هەر باشن ئەتوانن زەبوونیو دەبەنگیی خۆیان پینە بکەن ، باوجوو پینەی چیو پاشی چی ، تازە بیرو پەندی باپیران بەهێزترە لە ڕادەی زانیـــنو پێشکەوتنی سەردەم !! ] •

بام بزانین پیرو قەلەندەری گەنجینە چـــی ئەفەرموێ ؟ لەوەنەگەیشـــتم لەبابەت تاوانەکانی منەوە چییان تێچێن کردبێت • هیچ دوور نییـــە مێژووی پڕخیانەتکاریی کوڕی پاشایش لەکاتی داوای سەربەخۆیـیدا خرابێتەوە سەر لیستەکە !!

منیش وەکوو سنجووق قیت بەرامبەریان وەستابووم ، زرتو وریـــــا بەڕادەیەك خەریك بوو بدەمەوە لە شەقەی باڵو گوێ لە وڕینەی پیری موغان نەگرم ، بەڵام زوو لەم بیرە کشامەوە ••• ئەی لەکاتی هەڵدانی تۆڕی پولیسەکانا بۆ خۆم دەرباز نەکرد ؟

قازیی بەغدایی دەستێکی بـــە ڕیشیا هێناو زۆریش لە خۆی ڕازی بوو • ناهەقیشی نەبوو چونکە ئەوەتە دوای سەربەخۆییش کاربەدەستان هانـای بـــۆ ئەبەنو داوای یارمەتیی لێ ئەکەن ••• !! پاش تۆزێك جەنابـی قازی فەرمانی دادگای بڵاوکردەوە :ـ

[ مادەم لاشەی ئەم سەرە بڕاوە ون نییە لێتان ، بییانخەنەوە یەك ، بەڵام زمانی لەبندا ببڕن ] •

# چەند واتەو وانەیەکی ورشەدار

مەدحەت بێخەو

**(١) واتەی نامەیەك :**

نامەی کێوی «قەرەچۆخ»مان جەفەنگی بوو
کەس نەیزانی ••
لە دوای هەزاران کارەسات
لە لێواری ئەشکەوتێکدا •• شوێنەوارێکی باپیران
دۆزرایەوە
وەك چاوی گڕ
بۆ کلیلی نامەکە لێی هەڵکەنرابوو
وێنەی بیور •• !!

**(٢) خلیسـك :**

لە ڕێبەندانا شەختەی ڕێ
ورد نەبین لێی هەڵئەخلیسکێ
بەرەو نشێو ڕیسوا ئەبێ
بەڵام ڕێزان
بەهەنگاوو بیری چەسپاو
شەختەو هەورازەکان ئەبڕێ ••!

(٣) ناســـۆ :

ناسۆیەکان •• هێندە ئەویندارو شەیدان
هەموو ساتێك بۆ یەکتر دێن
لێویان بەیەکەوە ئەنێن
بە بایی‌بووی لاڕێیەکان پێ‌ئەکەنن
ئای چ مژدەیەك ئەبەخشن
کە بە چرپە •• شەوان لەگەڵ یەکتر ئەدوێن •• !

(٤) ورشـــە :

لە ڕێگادا لەپێش ورشە بێدارەکان
هەموو پەردەو دیوارەکان شەرمەزارن
لەناویانا •• ئاواتە سەوزو گەشەکان
دێنە بەرچاو
ڕەنگی زەردو بازوو ئامێر
کێڵگەی دێمو نسارەکان
بۆ یەکبوونی گشت ورشەکان
چاوەنواڕن •• !



« ئەو نامەیە کە شـاعیر ئەبێ بێگەیـەنێ ، ئەوەتە توانای بینین بە خەڵك ببەخشێ » •

پۆل ئێلوار

# باران

سەلام مەنمی

پێشکەشە بە حەسەنی قزلجی

( ١ )

زستان کۆتایی هات ، چیاو دەشت سەوز بوون •• مالاّت پشتیان گەرم بۆوە •• مەڕ دووبێر کرایەوەو مەیلی کۆڕبەستنی ئەکرد •• ڕەشەولاّخ کەوتنە مەگەزە •• ئافرەت بەرانێلی هەلّداو لەژێر مانگادا هۆرەی بۆ ئەکردو جامە شیری پڕئەکرد •• کاکەبرا ـ بە (پیرۆز)ی خێزانی وت :

ــ هەوار نزیك بۆتەوە •• ئەو بەنەی ڕستووتە تەختەیەك دەواری لێ دروست بکە ، ئەمساڵیش خێڵ لە زەوی‌یەکەی خۆماندا هەلّئەدا ، هەتا زوو بارکەین درەنگە ، بەشکم پەیناوێکی تێرو تەسەل بکرێ ••

ــ ناشکوری نەبێ جارێ باران خـۆی شاردۆتەوە ••

ــ سەری بێڕۆزی لەژێر گلاّیە •• هەروا نابێ •• ئەم خێڵە چەندەها قات‌وقڕیی بەخۆیەوە دیوە •• هەروەك خۆیشی وایە ••

(پیرۆز) بەنی ڕایەڵکرد •• بە هەپك کەوتە کوتانەوەی •• دەستە کچانی خێڵیش کۆمەکیان کردو بڕی‌یان ••

(کاکە برا)یش ئەستوونو کۆمانجو جلەی لە لایەکەوە ڕیزکــرد ، دەوارو چیخو هەمنو سەرتیلیش لە لایەکی‌ترەوە ••

( ٢ )

خێڵ دای بەیەکدا ، گای باریو گوێدرێژ بارکرانو قەتارەیان بەست •• دایك کۆرپەی لەکۆڵ بەست ، یخەو هەچەو وەحە دەستی پێکرد •• سەگەل دوای خێڵ کەوتن •• لە هەوارە بەرزە هەڵیاندا •• کاکەبرایش بارو بارگەی خستو ڕەشماڵی هەڵدا •• لایەك لە دەوارەکەی بۆ میوان تەرخانکرد •• لە ناوەڕاستا جێی کولێنو پۆڕکی کردەوە •• پاروێنکی بەدەوری دەوارا کێشا : « باشە پەچەڕانەکەیش لە سوورکەنەکەدایە، هەتا بڵێی بێبڕشتە • ساڵێکیتر نەمرین خەڵەکەی لە سەری سوار ئەدا •• لەگەڵ ئەوانەدا نیم ئەڵێن ساڵێکی تر تۆومان نابێ •• ئەم وڵاتە جێی فەڕە •• بێبارانی ساڵێك لەناومان نابات ••

( ٣ )

منداڵی خێڵ کەوتنە بووکەبارانێ •• خەڵکەیش دەستیان کردە خێرکردن •• (پیرۆز) بە کاکەبرای وت :

— بۆچی مەڕێك سەر نابڕی ؟

— ئەگەر بە خێر بێ زۆر کراوە ، بارانیش نەبەستراوە بە خێرەوە •• من لەو بڕوایەدام نە بووکەبارانێ باران ئەبارێنێ ، نە نووسینی ناوی چل کەچەڵ باران ئەبڕێ •

— تۆیش قسەکانی بەختیارەفەندیی ئامۆزات ئەکەیت • وا ئەو مەکتەبلی‌یە تۆ چی ؟!

— ساڵێك وەك ئێستا بێبارانی بوو •• خەڵك هەموو خێریان کرد • باوکیشم جووتێ مەڕی دا بەزەویدا ، بەڵام هەر نەباری •••

( ٤ )

سەیرێکی ئاسمانی کردو سەرێکی بادا : « پەڵە هەورەکەیش نەمـــا ! ئەڵێی ڕاوی ئەنێن •• ! پار ئەم‌وەختە گیاڕەش کەپرۆکەی کردبوو •• ماری ناوزەبەن پیاوی ئەخـــــوارد •• کێ لە کـــــەرەو شیرێـــــژی ئەپرسی •• بـــۆ نەگبەتی ئەمساڵ کرمەبڕەیش زۆرە •• هەموو جارێ باوکم ئەیوت :ـ هەر ساڵێ بێبارانی بێ شەلکەو تەبەق زۆر ئەبێ ••• » ڕۆژێ پەڵە هەورێکی ڕەش لە قیبلەوە دەرکەوت •• هەور بەرە بەرە زیادی ئەکردو سایەقـــەی دائەپۆشی •• خەڵك کەوتنە چاوەڕوانی •• ڕوویان گەش بۆوە ، مۆتەکەی بێورەیی شانی سووك کردن • مام برزوو پیاوێکی دنیادیدە بوو ، هەڵیدایە وتـــی :

ــ لە بەهاردا هەوری قیبلە بارانی پێوەیە ••

خەڵکەکە بوون بە دوو بەشەوە ، بەشێکیان ئەیانوت :

هەتا ئێستا چەند پەڵە هەورمان بە ئاسمانەوە دیـــوە ڕەویونـــەتەوە • بەشێکیشیان ئەیانوت :

ــ خاوەنی ئەزموونە لە خۆیەوە قسە ناکات ••

هەور یەکی گرت •• ناوچەوانی بەیەکا دا •• دەستی بـــە گرمـــەو چەخماخە لێدان کرد •• باران دایدا •• دەواری کەڕ کرد •• ژنانی خێـڵ دەواریان دابەست ، هەمن‌و سەرتیلیان توند کردەوە •• کاکـــە برایـــش کوڵەباڵەکەی لە شان کردو لە بن گابەردەکەی پشت ماڵەکەیانەوە سەیـــری بارانی ئەکرد •• گوێی لە تەپ‌و نمی ئەگرت •• هەوای سروشتی هەڵئەمژی : « هەر ئیمرۆو هەر ڕۆژانی ڕابوردوو •• مرۆف بێحەوسەڵەیە بەرگـــەی تەنگ‌و چەڵەمە ناگرێ • ئای بێبارانی چەند بەڵایەکی کوشـــندەی ! • وا بڕۆشتایە کەشکمان فەریك ئەبوو •• ژیانی خێڵ تاڵ ئەبوو •• » •

## (٥)

دڵەڕاوکێ ، چاوەڕوانی باریان کرد ·· گیا بووژایەوە ·· تـــۆزی دەوەنەکان وەری ·· بۆنی گوڵەکان دەمار دەمار ئەڕۆیشت ·· ماڵات کەوتەوە مەزاق ·· شوێنی کرمەبڕەکان پڕ بۆوە ·· گیاو لـۆ گزرە خـــران ··· کەشك لە لێواری دەوار هەڵخـــــرا ·· هـیـزە دەمی بـــۆ ڕۆنی زەنـــگ کردەوە ···

**فەرهەنگۆك :**

بەرانپێڵ : چارۆکەیەکە ئافرەت لە کاتی کارکردنا ڕاستو چەپ ئەیبەستێ ··
هەپك : دارێکی شانە شانەیە دەواری پێ ئەکوترێتەوە ··
کۆمانج : دارێکە ناوەڕاستەکەی کون ئەکرێ ··
ئەستوون : دارێکی درێژی ڕاستە ئەکرێ بە کونی کۆمانجا بە هەردووکیان دەوارەکە هەڵ‌ئەدرێ ···
کولێن : شوێنێکی تایبەتی‌یە لەناو دەوارا پێخەفو شتومەکی تیا دائەنرێ ··
پۆڕك : شوێنێکە لەناو کولێنا هەڵ‌ئەکنرێو زەخیرەی تێ‌ئەخرێ ··
شەلکە : شەلینی حەیوانی وردەیە ·
تەبەق : شەلکەی ڕەشە ولاخە ·
لـــۆ : گیایەکە بـــۆ حەیوانی وردە زەخیرە ئەخرێ ·
پاروێنك : جۆگەلەیەکە بەدەوری دەوارا ئەکێشرێ بۆئەوەی ئاوی تێ‌نەچێ ·
ناوی چل کەچەڵ : کاتێ باران زۆر بێ ناوی چل کەچەڵ ئەنووسن تا باران بیشواتەوە ·· گوایە بەوە باران ئەبڕێ ··!!
هەمن : پەتێکی مام ناوەندی‌یە دەواری پێ قایم ئەکرێ ·
چلە : دارێکی چەوتە ئەدرێتە ژێر هەمن ··
سەرتیل : گوریسێکە لە هەمن درێژترە ئەمسەرو ئەوسەری دەواری پـــێ ئەبەسترێ ·

# ورده هۆره

جەمال نووری

**١ ـ نزرگـــه :**

ـــ دوێنێ شەوێ ••

لە نزرگەی پیری شەوکێل ••• پاڕامەوە
کە ئازاری گیانی پەرپووتم •• سارێژ کات !

ـــ لە نهێنیی نیوەشەویا •• ڕاسپاردەیەکی دامێ
گەر بەرەو ماڵ گەڕامەوە ••

ـــ هەندێ بوخوردو داری عوودو چەند مۆمێ ••
بکەمە دیاریو بۆی بێنم ! گەر •• ڕێکەوتو گەڕامەوە

ـــ تا نزرگاکەی •• لە شەوی دەیجوورا •• ڕووناککەمەوە
کە خۆر هەڵهات !

ـــ سوێی ئازارە سەرشێتەکەم ••
ڕاسپاردەکەی پیری ••• لەبیربردمەوە !!



**٢ ـ شارە مێروولە**

ـــ کانیاوەکانی دەروونم •••
وشکیانکردو

— ئێستاکە ‥ شارە مێرووڵەن !

مێرووڵەکان ‥ هارو هاجن …

— وەکو ڕێچکەی دابەزیوی تیرەکانی ئەهلی خاچن !

خەرمانی گەنمە پایزە !؟

— لە ئەشکەوتی کەللەما پاشەکەوت ئەخەن !



## ٣ - ڕۆچوون

— کە بیرم لە تـــۆ کردەوە

چاوەکانت چۆن بوونە شووشەی پەنجەرە

زەنگەکانی ‥ چوارچێوەکانیان خواردەوە

— دەمەو بەیان ‥

منیش بوومە ‥ لوولی دووکەڵێکی سەرشێت ‥

بە کەلەبەری بنمیچی ژوورەکەمانا ‥ بۆی ڕۆچووم



« ئازیزەکەم ! متمانەت ببێ ، بێهوودە سەیری چاوە شینەکانی ناظـــم ئەکەن ، ئەگەر دەستی قەرەجێکی کلۆل ، دەستێ کە لە جالجالۆکەیەکی ڕەش ئەچێ ، بیەوێ ئەلقەی پەتەکە بخاتە ملم ‥ بـــەڵام ئەوان هەرگیز ناتوانن سەری مرۆیـــەك هەڵکـەنن ، بەو ئاســـانییە کە ئەتوانن سەلکـە شێلمێك هەڵکێشن » .

**ناظم حیکمەت**

لە نامەیەکدا بۆ مونەووەری ژنی

# هەڵوێستێك لە سێ وێنەدا

محەمەد نووری تۆفیق

- ١ -

هەر کە ڕۆژ ئەبوەوە لـــەناو دووکانێکا چارۆکەکەی ڕائەخستو بـــە شانەی دارو کەوچكو تیرۆكو قاڵبـــە کولیچـــەو دار جگەرەو هەندێ قاپو قاچاخی دەستکرد ئەیڕازاندەوە • زوربەی ئەو خەڵکەی بەو گوزەرەدا ڕێیان ئەکرد ، هەڵوێستەیەکیان بۆ ئەکردو ئەگـــــەر کڕیاریش نەبوونایە هـــەر ئەیاندایە بەر سەرنجو لێوردبوونەوە • ئەمیش ئافرەتێکی کەڵەگەت ، دەموچاو سوورو سپی ، لەش نەرمو نیان •• بەوردی سەرنجت بدایە ، هەرچی لـــە دەروونیا کۆبووبوەوە ، ئەیدایتێو بەئاسانی ئەتخوێندەوە • بۆیە زوربـــەی گوزەرەکە لەگەڵیا هاوکاری پەژارەی بوون • ئەمەش بووبوە هۆی هاندانی خەڵکەکە بۆ قۆستنەوەی شتەکانی سەر چارۆکەکـــەی با زۆر پێویستیشیان نەبوایە ، بۆ ڕازاندنەوەی ناوماڵەکانیان لەسەر مێزو جێگای تایبەتی دایانئەنان • ئەمە کارێکیوای کردبوو کە (نەشمیل) زۆر جار نەگاتە نیوەڕۆ ، دووکانی بپێچێتەوەو بەرەو ماڵ بێتەوە •

ئەم بازاڕ گەرمییەی (نەشمیل) پاڵی بە هەندێ کەسەوە نا کە چاویان بڕیبووە چارۆکەکـــەی بیر لەوە بکەنـــەوە کە خۆیو ئەوکەسانـــەی شتە دەستکردەکانیان بۆ ئەکرد بە پارەیەکی مۆڵو ژیانێکی چەور بکڕنو ، بـــۆ ئەم مەبەستە قسەیان دا بە یەکێکیان کـــە ئەو مژدەیە بخاتە مشتی ، تەنهـا

مەرجێکی بچووکی لەگەڵدا بێ ، ئەویش مانەوەی خۆیو ئەوانەیە بازاڕەکەی بۆ هەڵئەسووڕێنن ، بە مۆرو سەنەد ، هەتا هەتایە لەو شارەدا بمێننەوە •

ئەم داواکاری‌یە بچووکە بووە هۆی ئەوەی زوربەی خەڵکی شارەکـــە بەوەدا نەگەن کە بە شانەو تیرۆکو نەخش‌و نیگاری (نەشمیل) ماڵەکانیـــان بڕازێننەوە •• زۆر چاوەڕێ بوون ، بەڵام جارێکی‌تر نەشمیل‌و چارەکەکەی ئەو گوزەرەیان نەبینی‌یەوە •

- ٢ -

چێشتخانەیەکی گـــەورەی شارەکـــە دەستێکی باشی بەخۆیـدا هێناو جم‌وجووڵێکی گەرمی بەخۆیـــەوە دی • سێ چوار کوڕی لاوی گـــورج‌و گۆڵی لەگەڵ چەند کرێکارێکی پێشووتریا ڕیزکرد • کردنی بە تاقمە برایەکی ئیش‌وکار ڕاپەڕێن • ئەمانە هەرچەند لە دوان‌و گفتوگۆدا سەرو پۆتەڵاکـــی وشەو ڕستەی زوربەی ئەو خەڵکەیان ئەشکاند کـــە چێشتخانەکە ئەیگرتە خۆی ، بەڵام بەو ڕۆژگارە بە بێ‌دەنگ‌و قسەو بۆڵە لە ڕەنجدا بوون بۆ پـیرە چێشتخانە • ئەم کارەشیان زیاتر باخەڵی کابرای خاوەن چێشتخانەی لـــــە جاران تێرو پڕتر ئەکرد • نەیویست هەلی لە دەست بچێ ، بۆیە بیری لەوە کردەوە کە بە سەرشانی ئەمانا سەرکەوێ تا زیاتر لە خەزنەکە نزیک بێتەوەو لە سێبەری ئەمانا ئەوانی‌تر فت بکا کە شارەزای هەموو چاوچلێسی‌و هەست‌و نەستێکی لەوەوبەرینی • بە واتایەکـــی ڕەوانتر دوو چۆلەکـــە بە بەردێـك بکوژێ • ئەم مەبەستەی زمانی زیاتر لووس‌و پاراو کرد • لەسەر کورسی‌یەکی بەرامبەری هێشتنێوە ، پێی‌وتن :

ئەمەوێ چێشتخانەکەم بدەمە دەست ئێوە هەر چوارتان ، چونکە لـــەم ماوەیەدا بۆم دەرکەوتووە خاوێن‌و دەســـتپاکو دڵسۆزو ئیشکـــەرن ، وەك کرێکارەکانی‌تر نین‌و زۆر جیاوازیتان هەیە •

چاوەڕێی باشەی لێ کردن ، کەچی بەرگوێی نەکەوت • کاوەیان کە بە تیلی چاو بڕیاری هەر سێکیانی وەرگرتو لەگەڵ نیازی دڵی خۆیدا تێکەڵی کرد ، لەوان باشتر کابرا لە زمانی گەیشت :

— بۆچی بەتەنیا ئێمە هەر چوارمان ؟ ئەی براکانی‌ترمان ؟ کابرای خاوەن چێشتخانە بە ناوچەوانێکی لۆچاو لۆچو لچێکی هەڵقورتاوەوە هاتە دەنگ :

— ئێوە نایان‌ناسن •• ئەوان•• و ••• و و و •• پاش مزێکی تووڕەو درێژ لە جگەرەکەی •• پارەیەکی باشتان دەسگیر ئەخەم •• ئەتانکەم بە پیاو ! چێشتخانەکەتان ئەدمە دەست • ئەزانم شایانی ئەوەن •• ئەتانکەم بە کوڕی خۆم !! بەڵام ئەم قسانەم ناگاتەوە بە یەکێ لەوانی‌تر •• لە سەری مانگیش تێ‌ناپەڕێ نایەڵم یەکێکیان بەم بەردەمەدا گوزەر بکا •• ئێستا ئەڵێن چی ؟

— •••••

— ها وتتان چی ؟

— •••••

هەموو دە پانزە ڕۆژێکی بەسەرا نەڕۆیشت کە مشتەری‌یەکان کەوتنە هەواڵپرسینی کاوەو ئازادو دلێرو کاکا ڕەسوول •• کرێکارەکانیش دەستیان بە دەستا ئەکێشا بۆیان ••

## - ٣ -

لە کارگەیەکی ئەهلیدا دە دوانزە کرێکارێك چست‌و چالاکی‌یان بۆ کارگەکە زیاتر کردبوو • پێوەندی‌یان لەگەڵ کرێکارە کۆنەکانا توندتر کردبوو ، ئەوانیش بە گفتوگۆی شیرین‌و چاوی ڕێز دڵسۆزی‌یان ئەدانەوە •

ئەم کرێکارانە ڕۆژانە ئەوی پێیان ئەسپێررا ، بە بێسەرپێچیو بۆڵەو خوتە ڕایانئەپەڕاند • دواکەوتنو نەهاتنیان بۆ نەبوو ، مەگەر بۆ مەبەستێکی ئێجگار پێویست یا نەخۆشیی خۆیانو پرسەی کەسوکاریان بەرەنگار ببوایەتەوە •• کەم ئەدوان •• زۆر ڕەنجیان ئەدا •• ماوەیەك مانەوە ، خۆشەویستییان خستبوە دڵی کارگەو ئامێرو کرێکارەکانەوە • پاش ماوەیەك مقۆ مقۆ گوێی خاوەن کارگەی ئەزرنگاندەوە بەوەی کە کاکە حەمەو هاوڕێکانی ئەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ لای خۆیان ••• ناچار بوو بکەوێتە بنکڵێشەیان ، دڵیان بداتەوە •• قسەیان بۆ بکا بە بەرتیل • بۆئەمەش یەکە یەکە بانگی ئەکردنە ژووری بەڕێوەبەر •

— هەرچییەکت پێویستە لە پارە ، لە ماڵ ، هەر ئیشێکت هەیە لەم شارەدا ئامادەم بۆتی بکەم • ڕۆژانەکەت زیاد ئەکەم •• چێشتخانەتان بۆ دائەنێم • موخەسسەسات ، پارێزگاری ، هەرچی یاسای کارە بەزیادەوە پێشکەشی ئەکەم •• تەنها بەجێمانمەهێڵە •• مەچۆرەوە •• ئیجازەی باشت بۆ تەرخان ئەکەم ، جێم مەهێڵە ••

— ئەمانەو زۆر شتیتریش ڕێم لێ ناگرن کە نەڕۆمەوە • هەر یەکێکیان ئەم وەڵامە ڕەقەی بە مێشکی خاوەن کارگەیا ئەدا و بەوە کاسی ئەکرد و ئەویش بەرچاوی تاریك ئەبوو ••

هەرچەندە ویستی وا لە یەکێکیان بگەیەنێ کە ئەویتریان ڕازی بووە بە مانەوە ، بەڵام هەمرو ڕیسێکیان کردەوە بە خوری ••

کە ڕۆیشتنەوە کرێکارەکان گەلێ لە کارگەو خاوەن کارگەکە بەپەژارەتر بوون ••

# شیرین بشنەو

**محمد بەدری**

شیرین بشنەو
هەرچەن فەرهای لە تو دویرە
هەرچەن پایلێ لە زنجیرە
ئەمان گیانێ
ئەڕات سووزێ لفی کویرە
شەوو ڕووژی
وەدەس ئێ چەرخە نیچیرە
کلاٚفەێ خەم وە بایەو دێ
لە ڕێ کاروانی ئاسیرە



شیرین بشنەو
دیە شەو فەرهای وە خاوم هات
چی ئاسارەیگ لە شەو دەرهات
وتـەم هەرچەن
م هاماو دەر
خۆراکم زیخو گریانە
لەشم ها داوی بێگانە
سەرم کریا وە ملوانە
زوانم بەندێ زندانە

ئەمان هووشم ، ئەمان ویرم
لەلای دڵسوزی جارانە
(شیرین)ە مەرهەمی گیانە



شیرین بشنەو
کویەی بیستوون چەنێ سەختە
بەشی فەرهادی بەدبەختە
یە قەیرێگە وە تەوری عشقی تۆ
ناڵێکو هاوار کەی
یە قەیرێگە وە یایی زڵفی تۆ
زەخمەیلی تیمار کەی
چەنی چەن ساڵە ول ماگە
بەشی لێ ژینە خۆریاگە
دڵی وێ دەردە سووزیاگە
ئەمان گیانی
هێمان چی بیستوون ماگە
ئەرات گەردێ
لەلای ئاسانە گشت دەردێ



شیرین بشنەو
لە ڕێ بیم ، چی وهارێک بیم
لە گورانیمو هەڵبەستم قەتارێک بیم
لە رێ ئازارو محنەتدا چرایێک بیم

جوانو شاسوارێگ بیم
لەبڕ گلیام
لە دەوری ئاگرا گەڕیام
لەناکاو نالەنالو
یێ سدایێگ هات
وتـەم بشنەو
ئەڵس خەرمانەگەت سووزیا
گەنم ڕەنجت وە با دریا
منیش ئەی دووس
کە خەرمان سووزیا سووزیام
لە شارەیل دەروەدەر کریام
ئەڕای دەشتەیل وە زوور بریام
ئەمان هەی دووس
منێ بێکەس
منێ بێماڵو بێپشتگیر
منێ یەخسیر
هەتا دونیا هەسێ مینم
ژیانی خۆم وە زوور سینم



شیرین بشنەو
چەنێ فەرهای لە تۆ دویرەو
ئەکیشی جەوری بێزاری
ئەمان روزێ
وە چەم دینی

کە تو ڕەنج‌کیش‌و خەم‌بارە
وە ئاسـانی
ڕوبارێ ئاوی روون‌و پاك
ئەڕای بیستوونەگەت بیارێ
ئەرات بیارێ
گۆڵی ئازادی وە دیاری



شیرین بشنەو
چنەو مەم دووسی زین دێرێ
چنەو دێوانە بێ‌هووشەو
شەوو ڕووز دووسی شەم دێرێ
چنەو مەجنوون ئەڕای لەیلا
چەنی چەن ساڵە بێ‌شوونەو
خوراکی یادی جارانە
منیش چوی ئەی
چو دێوانەم ئەڕات گیانە ..



---

**پەراوێزەکان :**

بشنەو : گۆی‌بگرە
فەرهای : فەرهاد
دویرە : دوورە
پایلێ : هەردوو پێی
ئەڕات : بۆ تۆ ، لەبەرتۆ

سووزێ : ئەسوتێ

لفی : وەکو

ئێ : ئەم

وە بایەو دێ : بە با ئەدات

دیە شەو : دوێنی شەو

ئاسارە : ئەستێرە

وتەم : پێی‌وتم

م : من

ئەمان : بەڵام

ویرم : بیرم

چەنی : چەند

یەقەیرێگە : ئەبەندەوەیەکە

هێمان : هەتا ئیستاکە

ماگە : ماوە

گەردی : ئەگەڕێ

گلیام : کەوتم

ئەڵس : هەستە

دووس : دۆست

بیارێ : بهێنێ

---

**ڕەببی مووی لێ بێ زوبانی ، پەنجەکانی هەڵوەرێ**
**هەرکەسێ گوڵشەن بە چەشنی کولخەنی دۆزەخ بەرێ**

**ـ حەمدی ـ**

# بیرکردنتان هەر ڕێ یەکەوتنی بە دوو

فریاد فازیل

« پێشکەشە بەوانەی لە چاو تروو کانـــدنێکا لێیـان دوورکـەوتمـــەوەو لە هەموو چـاو لێکدانێکـــدا پێیان دەگەمەوە »

- ١ -

گیانە ، هەستە
چاوی گەشت هەڵبهێنەو
نیگای خەڵکی بخوێنەوە ...
گیانە ، ئاوڕ
لە سێبەری داری سەرت تێر بەرەوەو
ئەوجا وەرە
لە پێخەفیا تێر بخەوە

- ٢ -

گیانە ، هەستە .. دە دەی هەستە !
لە خەوی بێداریی شەوێ
بەئاگا بێو .. بکەوە ڕێ ..
تا تینوێتیی دەروونی من تێر بشکێنیو
لە بۆنی سینەو هەناسەت
تێر تێر بخۆم ..



گیانە ، هەستە •••
نیوە شەوە
بیرکردنت لێم نازڕێ •••
بۆتە تارمایی سەرچاوو
پەڵە خوێنە جێم ناهێڵێ



گیانە ، هەستە •• لێم تێبگە :
دە تێبگە !

بێ نیگای تۆ
لاشەیەکی سستو ماتم
لەگەڵ خۆما هەنگاو ئەنێم

دێمە لاتو لێم ئەتۆرێیت
هەنگاو ئەنێم
هەتا زووتر بە یەك بگەین
لە گەردنی یەك بئاڵێین

تێر تێر داوای یەکتر بکەین••
هەنگاو ئەنێم
بانگت ئەکەم

هۆ گیانەکەم
لەگەڵ تۆمە ، دەنگ بۆ ناگاتە لای ئێوە ؟

هۆ گیانەکەم
ئاوڕێکم لێ بەرەوە ••• تارمایی مەرگ جێبهێڵە ••

هۆ گیانەکەم
لەگەڵ تۆمە
باش ئەزانم
هەنگاو ئەنێی ، ئاشنای تۆ لەگەڵ خۆرا !
هۆ گیانەکەم !
بیرتان ئەکــەم
بۆیە ئێستا
نیوەشەوێکی درەنگەو
کەچی هێشتا
سەرچاوەی خەونو ئەندیشەن

**بەرلین**
**١٩٧٧/٩/٢٩**



**من سەربازی ئامانجێکم ، پیرۆزە**
**فیداکاری ڕێگایەکم ، بێگەردە**
**ڕەنجێك ئەدەم ڕەنجی پیاوی دلسۆزە**
**لە ڕێیەکا بێباك ئەمرم ڕێی مەردە**

**گۆران**

# دەستەی سەرۆکایەتیی
# کۆنگرەی پێنجەمی ی • ن • ك

لە ژمارەی پێشوودا ئەوەمان لەیادچوو کە باسی سەرۆکایەتی کردنی کۆنگرەی پێنجەمی یەکێتیی نووسەرانی کورد بکەین • وا لێرەدا باسی ئەکەین :

لە سەرەتای کۆبوونەوەی دەستەی گشتیدا ، کاری دەستەی ئامادەکەری کۆنگرە لەلایەن ئەندامانی دەستەی گشتییەوە بەدوایی هاتوو دانراو ئەم برایانە هەڵبژێرران بۆ ئەندامەتیی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆنگرە :

عیززەدین فەیضی
موستەفا سالح کەریم
کاکەی فەلاح
عەلی شەونم
سەبری بۆتانی
کەمال غەمبار
سەلام موحەممەد

ئەوانیش لەناوخۆیانا مامۆستا عیززەددین فەیضییان بە سەرۆك هەڵبژارد •

شایانی باسە ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتی زۆر بە ڕێکوپێکی دانیشتنەکانی کۆنگرەیان بەڕێوەئەبردو لەوپێناوەدا زۆر ماندوو بوونو جۆری هەڵسووڕانیان مایەی ڕەزامەندیی‌و قەدرزانینی ئەندامانی کۆنگرە بوو •

# چالاکیی کولتووریی

# لقی ی . ن . ك لە سلێمانی

## لە وەرزی ١٩٧٨ - ١٩٧٩ دا

لقی یەکێتیی نووسەرانی کورد لە سلێمانی لە پرۆگرامی کولتووریی ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩یدا گەلێ کۆڕی گەورەی ئەدەبیو ڕۆشنبیریی پێکهێناوە کە هەزاران کەس تیایاندا بەشدار بوونو کۆمەڵێك لە ڕۆشنبیران لە سلێمانیو بەغداو هەولێر قسەیان تیا کردووە بۆ خەڵك • وا بەکورتی لێرەدا باسی ئەو کۆڕانە ئەنووسینەوە :

**وەرزی یەکەم :**

(١) کۆڕێکی شیعری لەلایەن شاعیر حەمە ساڵح دیلانەوە لە ١٩٧٨/١٠/٢٧دا • گفتوگۆو دەمەتەقێ لەگەڵ کردنی شاعیر لەلایەن ع•ع• شەونمو حەسیب قەرەداغییەوە •

(٢) منو شیعر ، دوانێك لەلایەن دوکتۆر عیززەددین مستەفاوە لە ١٩٧٨/١٢/١دا • پێشکەش کردنی لەلایەن حەمە ڕەشید فەتاحو ساجید ئاوارەوە •

(٣) مێژووی هونەر لەلایەن هونەرمەند ئەحمەد سالارەوە لە ١٩٧٨/١٢/٨دا • پێشکەش کردنی لەلایەن عەبدوڵڵا ئاگرینو حەمە سەعید قەرەداغییەوە •

(٤) میهرەجانی بیرەوەریی مامۆستا گۆران لە ١٩٧٨/١٢/١٥دا کە ئەم ئەدیبانە تیا بەشدار بوون : د • عیززەددین مستەفا ، سەعید ناکام ، کاکەی فەللاح ، کەمال میراودەلی ، مستەفا ساڵح کەریم (بە ناوی لقی سلێمانییەوە) ، هێرۆ گۆران (بە ناوی بنەماڵەی شاعیرەوە) •

(٥) میهرەجانی بیرەوەریی بێکەس لــە ١٩٧٨/١٢/٢٩دا کە ئــەم ئەدیبانە بەشداری‌یان تیا کرد : موحەممەدی مەلا کەریم ، عەبدوڵڵا عەبباس ، حەسیب قەرەداغی ، ئەکرەم قەرەداغی (بە ناوی لقی سلێمانی‌یەوە) ، شێرکۆ بێ‌کەس (بە ناوی بنەماڵەی شاعیرەوە) • ڕەئووف بێ‌گەرد بەشدارانی ئــەم میهرەجانەی پێشکەش ئەکرد •

(٦) شانۆو شانۆگــەریی مناڵ ، لەلایــەن موحەممــەد حەمەڕەحیم ڕەمەزانەوەو ، کورتە چیرۆکێکی بەیان صەفەدی کە حەمە ڕەشید فەتاح کردبووی بە کوردی لە ١٩٧٩/١/١٩دا • عەبدوڵڵا ئاگرین ئەم کۆڕەی پێشکەش کرد •

(٧) سێ چیرۆك و ڕەخنەگرێك لە ١٩٧٩/٢/٩دا • چیرۆكنووسەکـان عەبدوڵڵا سەڕاج‌و حەمەکەریم عارف‌و ئەحمــەد محەمەد ئیسماعیل بوون • ڕەخنەگرەکەش حەسەن جاف بوو • عەبدوڵڵا ئاگرین ئــەم کۆڕەی پێشکەش کرد •

(٨) هەڵسەنگاندن‌و لێکۆڵینەوەی (جگەر گۆشەکان)ی کاکەی فــەلاح لەلایەن حەمە ڕەشید فەتاحەوەو ، کورتە باسێ دەربارەی ئەدەبی منالان لەلایەن ئازاد عەبدولواحیدەوە لە ١٩٧٩/٢/٢٣دا • حەمە سەعید قەرەداغی ئەم کۆڕەی پێشکەش کرد •

(٩) لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەیی‌و گیروگرفتی ڕەخنــەی ئیمڕۆ لەلایــەن صەباح غالبەوە بە پاچوونەوەی کەمــال میراودەلی‌و ، قوتابخانــەی نی‌کاریی دەروونی لە ڕەخنەی ئەدەبیدا لەلایەن ئەکرەم قەرەداغی‌یەوە •

(١٠) ئافرەت‌و ڕۆڵی ڕاستەقینەی لە کۆمەڵدا لەلایەن هەڤاڵ کوێستانی‌یەوە بە پێشکەش کردن‌و هەڵسەنگاندنی کەمال میراودەلی‌یەوە لە ١٩٧٩/٣/٩دا •

(١١) میهرەجانی دووەمی شــیعری کوردی لــە ٢٩و ١٩٧٩/٣/٣٠دا [ بەدرێژی لە لایەکی‌ترا لەم میهرەجانە دواوین ] •

**وەرزی دووەم :**

(١) باسێك دەربارەی ڕێنووسی کوردی لەلایەن ڕەئووف ئالانی‌یـــەوە لە ١٤/٤/٩٧٩دا •

(٢) وتارێ دەربارەی پەروەردەکردنی منداڵ لەلایەن ع•ع• شەونمەوە لە ١٥/٤/٩٧٩دا کە طاهیر صاڵح سەعید پێشکەش‌کەری بوو •

(٣) شەڕو ئاشتی لە شیعری کوردیدا لەلایەن موحەممەدی مەلا کەریمەوە لە ٢٦/٤/١٩٧٩دا کە شێرکۆ بێکەس پێشکەش‌کەری بوو •

(٤) کێ بەرپرسیارە لە کپ‌کردنی دەنگی جەمال نووریی شاعیر ؟ لەلایەن ئەحمەد سەلامەوە لە ٢٩/٤/١٩٧٩دا کە طاهیر صاڵح سەعید پێشکەش‌کـەری بوو •

(٥) کرێکار لە چیرۆکی کوردیدا لەلایـــەن ڕەئووف حەسەنەوە لـــە ٣/٥/١٩٧٩دا کە ڕەئووف بێگەرد پێشکەش‌کەری بوو •

(٦) پرۆژەی تێڕوانینێکی نوێ بۆ مۆسیقای شیعری کوردی لەلایـــەن دوکتۆر ئیحسان فوئادەوە ، لـــە ١٠/٥/١٩٧٩دا کـــە کاکـــەی فەلـــلاح پێشکەش‌کەری بوو •

(٧) ڕووناکیریی وەلی دێوانە لەلایەن موحەممەد ئەمین هەورامانی‌یەوە لە ١٢/٥/١٩٧٩دا ، کە ع•ع• شەونم پێشکەش‌کەری بوو •

(٨) چلەی خوا لێ‌خۆش‌بوو شاعیر أ•ب• هەوری لە ١٧/٥/١٩٧٩دا کە ئەم ئەدیبانە تیا بەشدار بوون : دوکتۆر عیززەددین مستەفا ڕەسووڵ (بە نامـــە) ، دوکتۆر مارف خەزنەدار (بە برووسکە) ، مامۆستا شێخ موحەممـــەدی خاڵ ، مامۆستا موحەممەد مستەفا کوردی ، مامۆستا عەبدولقادر قەززاز ، کامیل ژیر ، ع•ح•ب ، حەسیب قەرەداغی ( بە ناوی لقی سلێمانی‌یەوە ) ، خەلیل موحەممەد

(بە ناوی لقی دهۆکەوە) ، فەرید زامدار (بە ناوی لقی هەولێرەوە) ، حەمە سەعید حەمە کەریم (بە ناوی لیژنەی ڕۆشـنبیریی بەڕێوە بەرێتیی ڕۆشنبیریی جەماوەرەوە) ، شێخ مەجید شێخ جەلال (بە ناوی بنەماڵەی خوا لێخۆش بوەوە).

**وەرزی سێهەم :**

(١) یادی پیرەمێردو بیرەوەریی ئەفسەرەکان لەلایەن مستەفا ساڵح کەریمەوەو ، حەسیب قەرەداغیو تاقیکردنەوەی شیعریی لە ١٩/٦/١٩٧٩دا .

(٢) ئیبراهیم خانی دەلۆیی لەلایەن مستەفا نەریمانەوە لە ٣٠/٦/١٩٧٨دا کە کەریم زەند پێشکەش کەری بوو .

(٣) تێڕوانینێکی نوێ بۆ فۆلکلۆری کوردی لەلایەن دوکتۆرە نوکریە ڕەسوولەوە لە ٥/٧/١٩٧٩دا کە ئەکرەم قەرەداغی پێشکەش کەری بوو .

(٤) چمکێك لە گەشتەکەی ئەولیا چەلەبی لەلایەن سەعید ناکامەوە لە ١٢/٧/١٩٧٩دا کە صەباح غالب پێشکەش کەری بوو .

(٥) حسەین عارف ڕابەری نوێ خوازییە لە چیرۆکی کوردیدا ، لەلایەن عەبوولڵا عەباسەوە لە ١٩/٧/١٩٧٩دا کە جیهان عومەر پێشکەش کەری بوو .

(٦) منو شیعری کوردی لەلایەن موحەممەد بەدرییەوە ، لە ٢٦/٧/١٩٧٩دا کە حەسیب قەرەداغی پێشکەش کەری بوو .

چەند کۆڕێکیتریش بەدەستەوەیە کە تا بەستنی کۆنگرەی شەشەم بگیرین . لەمانە دوو کۆڕ بۆ چیرۆكو هەڵسەنگاندنیان ، باسێکی شانۆ ، هێمنو ناڵەی جودایی ، شیعری شاعیرە ئافرەتەکانمانو هەڵسەنگاندنیو چەند کۆڕێکیتری ئەدەبیو ڕۆشنبیری کە لەکاتی خۆیدا هەواڵیان ڕائەگەیەنرێ .

# میهرەجانی دووەمی شیعری کوردی

بە چاودێریی پارێزگاری سلێمانی بەڕێز کاك ئەرشەد ئەحمەد موحەممەد لە ڕۆژانی ٢٩ و ١٩٧٩/٣/٣٠دا ، بە بۆنەی جەژنەکانی ئازارو نەورۆزەوە ، یەکێتیی نووسەرانی کورد دووەم میهرەجانی شیعری کوردیی لە شاری سلێمانی سازکرد • سەعات چواری پاش نیوەڕۆی ڕۆژی پێنجشەممە هۆڵی نەقابەی کرێکاران کە بە دروشمی ڕەنگاوڕەنگ ڕازابووەوە ، جمەی ئەهات لە دانیشتوانا • بەڕێز پارێزگارو نوێنەرانی پارتی بەعسی سۆشیالیستی عەرەبو مێوانێکی زۆرو ژمارەیەکی یەکجار زۆرتر ئەدەبدۆست لە لاوو پیرو ژنو پیاو ئامادەبوونو سەدانیتریش لەبەر بێجێگایی لە دەرەوەی هۆڵەکە بەپێوە ڕاوەستابوون بۆ گوێگرتن • دوای ئەوەی بەڕێوەبەرانی ئاهەنگی کردنەوەی میهرەجان کە لە برایان کەمال میراودەلیو ڕەئووف بێگەردو جیهان عومەر پێکهاتبوون ، بەخێرهاتنی میوانەکانیان کرد ، بەڕێز دوکتۆر عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ سەرۆکی یەکێتیی نووسەرانی کورد وتارێکی بە زمانی کوردی پێشکەش کرد • دوابەدوای ئەو سەرۆکی لقی سلێمانی مامۆستا مستەفا ساڵح کەریم وتارەکەی دەستەی بەڕێوەبەری بە عەرەبی پێشکەش کرد • ئەمجا شاعیرانی یەکەم ئێوارە دەستیان بە شیعر خوێندنەوە کرد کە ئەم شاعیرانە بوون :

(١) خورشیدە بابان (هەڵەبجە)

(٢) حەمە عەلی مەدهۆش (بەغداد)

(٣) سەبری بۆتانی (دهۆك)

(٤) کەریم شارەزا (هەولێر)

(٥) حەمە ئەمین پێنجوینی (سلێمانی)

(٦) صەلاح شوان (بەغداد)

(٧) طاها مائی (دهۆك)

(٨) جەلال بەرزنجی (هەولێر)

(٩) میرزا موحەممەد ئەمین (سلێمانی)

(١٠) موئەیەد طەیب (دهۆك)

(١١) حەسیب قەرەداغی (سلێمانی)

بۆ ڕۆژی دووەم لە سەعات دەی سەر لـــە بەیانی دووەم کۆڕێ شیعر خوێندنەوە دەستی پێ کرد کە ئەم شاعیرانە تیا بەشدار بوون :

(١٢) عەلی عەبدوڵڵا شەونم (سلێمانی)

(١٣) لەتیف هەڵمەت (کەرکووك)

(١٤) موحسین ئاوارە (هەولێر)

(١٥) جەوهەر کرمانج (هەولێر)

(١٦) ئەژی گۆران (سلێمانی)

(١٧) سەگڤان عەبدولحەکیم (دهۆك)

(١٨) حەمە سەعید قەرەداغی (سلێمانی)

(١٩) هاشم کۆچانی (کەرکووك)

(٢٠) عوثمان شەیدا (سلێمانی)

(٢١) ناصر حەفید (سلێمانی)

(٢٢) داری ساری (بەغداد)

(٢٣) ئەحمەد شوکری (سلێمانی)

سێیەم کۆڕ ، سەعات چواری پاش نیوەڕۆی هەینی ١٩٧٩/٣/٣٠ کرایەوە کە بەڕێز پارێز گاری سلێمانی مامۆستا ئەرشەد ئەحمەد موحەممەدیش تیا بەشدار بوو و ئەم شاعیرانە شیعریان تیا خوێندەوە :

(٢٤) خەلیل موحەممەد (دهۆك)
(٢٥) شێرکۆ بێکەس (سلێمانی)
(٢٦) نەژاد ئەزیز سورمێ (هەولێر)
(٢٧) کاکەی فەللاح (سلێمانی)
(٢٨) حەمەئەمین کاردۆخی (سلێمانی)
(٢٩) سەعدوڵڵا پەرۆش (هەولێر)
(٣٠) عەبدولڕەحمان مزووری (دهۆك)
(٣١) موحەممەد شێخ حوسەین بەرزنجی (سلێمانی)
(٣٢) موحەممەد بەدری (بەغداد)
(٣٣) هەڤاڵ کوێستانی (سلێمانی)
(٣٤) عەبدولکەریم دەشتی (هەولێر)
(٣٥) خەبات عارف (سلێمانی)
(٣٦) موحەممەدی مەلا کەریم (بەغداد)

لەدوای تەواوبوونی میهرەجـــان دوکتۆر عیزەددین مســـتەفا وشـەی ماڵئاوایی‌و سوپاسی پێشـــکەش کرد • ئەمجا هەموو شـاعیرە بەشدارەکـانو دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی لەسەر بانگ‌کردنی بەڕێز پارێزگاری سلێمانی کە خوانی ئێوارەی بۆ ڕازاندبوونەوە ، بەرەو ئوتێلی ئاشتی ڕۆیشتن •

شایانی وتنە هەر لە دانیشتنی یەکەمی میهرەجانەکەدا مامۆستا موحەممەدی مەلا کەریم بەناوی دەستەی بەڕێوەبەرو دانیشتوانەوە تەلگرافێکی خوێندەوە کە بۆ بەڕێزان سەرکۆمارو جێنشینی ســـەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایـــەتیی شۆڕش نێررابوو •

ئەوەشمان لەیادبێ کەوا دەستەی بەڕێوەبەری لقی یەکێتی لە سلێمانی بـە گیانی لەخۆبوردنەوە بۆ ئامادەکردنی ئەم میهرەجانە هەڵسووڕانو ماندووبوونو میهرەجانەکەیان بەشێوەیەکی پڕ شانو شکۆ بەرپا کرد •

# هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبەری ی ٠٠ ن ٠٠ ك
# لقـــی ســـلێمانـــی

ئێوارەی ڕۆژی ١٥/١٠/١٩٧٨ ، بەپێی نامـــەی ژمارە ٩٨٦٤ی ڕۆژی ١٠/١٠/١٩٧٨ی پارێزگای سلێمانیو بە ئامادەبوونی حاکم مامۆستا جەمـال شەریف حسێنو سەرۆکی یـەکێتیی نووســـەرانی کورد دوکتۆر عیزەددین مستەفا ڕەسوولو نوێنەری ئاسایشو نوێنەری پارێزگارێتیی سلێمانی ، لــە بارەگای یەکێتیدا لە سلێمانی ، دەستەی بەڕێوەبەری لق هەڵبژێرانو لــە سەرجەمی ٦٥ ئەندام ٥٧ ئەندام لەم هەڵبژاردنەدا بەشدار بوون ٠

لەم هەڵبژاردنەدا ئەم برادەرانە خۆیان بۆ ئەندامێتیی دەستەی بەڕێوەبەری لق دیاریکرد :

ڕەئووف بێگەرد ، حەسیب قەرەداغی ، مســـتەفا سالح کەریم ، عەلی عەبدوڵڵا شەونم ، موحەممەد موحەممەد ئەمین قادر (کاکەی فەللاح) ، حەمـــە ڕەشید فەتاح ، فوئاد قەرەداغي ، ساجید ئاوارە ، عەبدوڵڵا عەزیز ئاگریـــن ، ئەحمەد سالار ، صەباح غالب ، موحەممەد ئەمـــین کاردۆخـــی ، ئـەحمـەد شوکری ، ئەکرەم قەرەداغی ، طاهیر صالح سەعید ، جیهان عومەر ، ســـەلام مەنمی ، ڕەشید هەورامی ، عەبدوڵڵا میدیا ، حەمە سەعید حەسەن قەرەداغی ، کەمال ڕەئووف ، موحەممەد حەمە باقی ٠

لەئەنجامی هەڵبژاردنو دەنگداندا دەرکەوت دەنگەکان بەمجۆرە دابەش بوون :

حەسیب قەرەداغی (٣٦ دەنگ) ، مستەفا سالح کەریم (٣٤ دەنگ) ، صەباح غالب (٣٤ دەنگ) ، ئەکرەم قەرەداغی (٣٢ دەنگ) ، طاهیر صالح سەعید (٣٢ دەنگ) ، ڕەئووف بێگەرد (٣١ دەنگ) ، جیهان عومەر (٢٨ دەنـــگ) ، عەبدوڵڵا عەزیز ئاگرین ( ٢٥ دەنگ) ، حەمە ڕەشید فەتاح (٢٥ دەنگ) ، فوئاد قەرەداغی (٢٤ دەنگ) ، کاکەی فەللاح (٢٤ دەنگ) ، عەلی عەبدوڵڵا شەونـــم (٢٤ دەنگ) ، ئەحمەد سالار (٢٣ دەنگ) ، ڕەشید هەورامی (٢٣ دەنگ) ، ساجید ئاوارە (٢٢ دەنگ) ، سەلام مەنمی (٢١ دەنگ) ، موحەممەد حەمە باقی (٢١ دەنگ) ، حەمە سەعید قەرەداغی (١٦ دەنگ) ، عەبدوڵڵا میدیـــا (١٤ دەنگ) ، ئەحمەد شوکری (٨ دەنگ) ، موحەممەد ئەمین کاردۆخی (٦ دەنگ) ، کەمال ڕەئووف (٦ دەنگ) ٠

پاش خوێندنەوەی ناوەکانو ژماردنی دەنگەکان دەرکەوت مامۆستایـــان حەسیب قەرەداغیو مستەفا سالح کەریمو صەباح غالبو ئەکرەم قەرەداغیو طاهیر صالح سەعیدو رەئووف بێگەردو جیهان عومەرو عەبدوللا ئاگرینو حەمە ڕەشید فەتاح بوون بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبـــەرو ، مامۆستایـــــــان کاکەی فەللاحو عەلی عەبدوللا شەونمو فوئاد قەرەداغییش یەکی ٢٤ دەنگیان هێناوە ، جا لەبەرئەوە کە کەسیان خۆی نەکێشایەوە تا ئەو دوانەکەیان ببن بە ئەندامی تەنگانە ، دەویان بۆ کراو لەئەنجامدا کاکەی فەلاحو فوئاد قەرەداغی بوون بە ئەندامی تەنگانە ٠

هەر لە ئێوارەی هەمان ڕۆژدا ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەر کۆبوونەوەو کاریان بەم جۆرە لەنێوان خۆیاندا دابەشکرد :

١ ـ مستەفا سالح کەریم (سەرۆك) ٠

٢ ـ حەسیب قەرەداغی (جێگری سەرۆك) ٠

٣ ـ ئەکرەم قەرەداغی (سکرتێری بەڕێوەبەرێتی ٠

٤ ـ حەمە ڕەشید فەتاح (سکرتێری کولتووری) ٠

٥ ـ صەباح غالب (ژمێریار) ٠

٦ ـ ڕەئووف بێگەرد (ئەندام) ٠

٧ ـ طاهیر صالح سەعید (ئەندام) ٠

٨ ـ جیهان عومەر (ئەندام) ٠

(٩)ـ عەبدوللا ئاگرین (ئەندام) ٠

لە ١٩٧٩/٤/٥یشدا بەپێی پێڕەوی ناوخۆی یەکێتی مامۆستا کاکـەی فەللاح لەجێی مامۆستا حەمە ڕەشید فەتـاح هاتە دەســــــتەی بەڕێوەبەرەوەو مامۆستا طاهیر صالح سەعیدیش هەڵبژێررا بە سکرتێری کولتووری ٠

# پێرست




لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا

ژمارە (٢٤)ی ساڵی ١٩٧٩ی دراوەتێ

# NÛSERÎ KURD

Govarî yekêtîy Nûseranî Kurd
Jimare (2) , Xulî Dûwem , Abî 1979
Serokî Nûsîn
**Dr. Izzedîn Mistefa Resûl**
Sikirtêrî Nûsîn
**Muhemmedî Mela Kerîm**
Beğda - Iraq

---

نرخی ٣٥٠ فلسه

مطبعة علاء ـ وزيرية ـ هاتف ٢٤٩١٥